# ئەدەبی بیگانە



بەشی یەکەم

بە سەرپەرشتی : عەزیز گەردی

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی جەوهەری - هەولێر -

# ئەدەبی بێگانە

کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبی‌یە لە ئینگلیزی‌یەوە کراوە بە کوردی

بەشی یەکەم

بەسەرپەرشتی

عەزیز گەردی

« کتێبخانەی حەیدەری » بڵاوی کردۆتەوە

چاپخانەی الحوادث..

بەغدا ـ ١٩٨٢

# لەباتی پێشەکی

ئەدی چۆن ؟ ئاو بوەستێ گەنی دەبێو دەرگاو پەنجەرە لەسەر خۆت دابخەی هەوای ژوورێ پیس دەبێو ئیدی هەناسەت تەنگ‌و پشووت سوار دەبێو ناچاری ناو بە ناو هەوایەکی تازەو پاك هەڵمزی بۆ ئەوەی بتوانی بە چوست‌و چالاکی ئیش بکەی .

(ئەدەبیش) هەروایە ؛ ئەدەبی هەر نەتەوەیەك ئەگەر لە قاوغێکی تەسك گیر بخواتەوە کزو بێ هێز دەبێو لە کەژاوەی شارستانیو لە ئەدەبی نەتەوە زیندووەکانی‌دی دوا دەکەوێو ناتوانێ بەشداری گۆڕینی پێشکەوتنخوازانەی باری نەتەوەو میللەت بکا ، بۆیە دەبێ هەر نلو بە ناو هەوای ئەدەبی پێشکەوتووی نەتەوەکانی‌دی هەڵمزێو ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر بگەشێتەوەو پێشتر بکەوێ . بەڵام بەو مەرجەی ئەدەبی نەتەوایەتی مۆرکی ڕەسەنی خۆی نەدۆڕێنێ . ئەدەبی ڕەسەن ئەو ئەدەبەیە کە لە واقعی نەتەوایەتی‌یەوە هەڵدەقوڵێو ئەگەر وەربگێڕدرێتەوە سەر هەر زمانێکی دی لەدوورەوە هاوار دەکاتو هەر کەسێکی بە زمانی ... هەر زمانێك بیخوێنێتەوە یەکسەر دەزانێ ئەمە ئەدەبی فلانە نەتەوەیەو لە فلانە سەردەم نووسراوەو بۆنی فلانە خاك‌و هەوای لێ‌دێ . بە کورتی وا چاکە وەکو

گاندی گۆتەنی ڕێگای هەموو جۆرە هەوایەك بدەین بێتە ژوورەوە بەڵام لێنەگەڕێین سایتەی خانوومان هەڵتەکێنێ •

بێ‌گومان بۆ ئەوەی بتوانین ئاگاداری ئەدەب‌و بیرو ڕۆشنبیری نەتەوەکانی‌دی بین‌و سوودیان لێ‌وەربگرین دەبێ زمانی ئەو نەتەوانە بزانین‌و بەرهەمەکانیان بخوێنینەوە ، بەڵام دیارە زمان‌زانین بۆ هەموو ڕۆڵەکانی میللەت نارەخسێ بۆیە ئەرکی ناساندنی ئەدەبی بیانی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسانەی زمانی بیانی دەزانن‌و شارەزای ژیان‌و شارستانێتی بێگانانن • ناساندنەکەش بەوە دەبێ کە چاکی لێ بکەن بەلاداو شەو بخەنە سەر ڕۆژو هەموو خۆشی‌یەکی خۆیان وەلا بنێن‌و بکەونە سەر وەرگێڕانی ئەدەبیاتی بیانی‌و بیخەنە بەر دەستی خوێندەوارانی نەتەوەکەیان •

وەرگێڕان دەورێکی گەورەو دیاری هەیە بە تایبەتی ئەگەر وەرگێڕەکە وەستایەکی باش بێت‌و هەردوو زمانەکە ( ئەوەی لێ‌ی‌وەردەگێڕێ‌و ئەوەی بۆی وەردەگێڕێ زۆر باش بزانێ‌و لە کاتی وەرگێڕانیش‌دا پشووی درێژ بێ‌و زوو تەنگەنەفەس نەبێ ؛ چونکە وەرگێڕانی بەرزو سەرکەوتوو هێمنی‌و بێندرێژی‌و ئەشق‌و سووتانی دەوێ ، خۆبەخت‌کردن‌و دڵمراندنی دەوێ ، گەڕان‌و پشکنین‌و سووڕبوونی دەوێ •

وەرگێڕان کارێکی هێندە ئاسان نی‌یە • وەرگێڕان هونەرو زانستە • زانستە ؛ چونکە دەبێ وەرگێڕەکە ئاگای لە چۆنیەتی وەرگێڕان‌و جۆرەکانی وەرگێڕان‌و گیروگرفتەکانی وەرگێڕان هەبێ • دەبێ دەستوورو بنەماکانی وەرگێڕان بزانێ‌و لە کاتی وەرگێڕان‌دا سوودیان لێ‌وەربگرێ ••• هونەریشە ؛ چونکە دەبێ وەرگێڕەکە هونەرمەندو بەهرەدار بێ‌و بتوانێ بە جۆرێکی هونەری ئەوتۆ دەقەکە وەربگێڕێ‌و بە

زمانێکی نەتەوایەتی ئەوەندە نەرمو ناسكو بەپێز دایبرێژێ کە کەس نەزانێ ئەمە وەرگێڕانەو هەر کەسێ خوێندی‌یەوە وا تێبگا کە ئەمە نووسینی وەرگێڕەکە خۆیەتی نەك وەرگێڕان •

بێ‌گومان ئێمەی کورد لەچاو نەتەوەکانی‌دی بزووتنەوەی وەرگێڕانمان زۆر کزەو ئەوەی کە هەیشە کەمێکی کەمی لێ‌دەرچێ ئەوەی‌دی لە کەمو کورتی خاڵی نی‌یەو مەرجی هونەری‌و زانستی لێ‌نەهاتۆتە دی ؛ بۆیە ئەرکێکی نەتەوایەتی سەرشانی هەموومان ئەوەیە کە بە پێی توانا بەشداری پێشخستنی بزووتنەوەی وەرگێڕان بکەین‌و چیمان لەدەست دێ درێغی نەکەین • دیارە ئەم ئەرکە گەورەیەش دەکەوێتە ملی ئەو ڕۆشنبیرە کوردانەی کە زمانی بیانی ، بە تایبەتی زمانی ئەوروپی ، دەزانن • تەماشا دەکەی هەموو ساڵێ سەدان تا بەڵام دەیان گەنجی لێهاتووی کورد بەشی زمانە ئەوروپی‌یەکان لە زانکۆکان تەواو دەکەن، ئەو گەنجە بە توانایانە ئەگەر نەیکەنە تەمبەڵی‌و کەمتەرخەمی دەتوانن بەشداری‌یەکی باشی ئەم ئەرکە بکەن‌و هەر یەکە چ کتێبێکیان پێ‌خۆشەو لەگەڵ حەزو ئارەزوویان دەگونجێ بیکەنە کوردی •

بەشی زمانە ئەوروپی‌یەکانی زانکۆی ( مووسل )یش زۆر قوتابی بە تواناو لێهاتووی تێدایە کە مەبەستیانە خزمەتی زمان‌و وشەو ئەدەب‌و ڕۆشنبیری خۆمان بکەن‌و دیارە هەر بۆ ئەوەش خۆیان فێری زمانی ئەوروپی دەکەن تا خزمەتی زمان‌و نەتەوەی خۆمانی پێ‌بکەن ••• جا ئەو کاتەی کە پێشنیاری بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە هاتە ئاراوە هەموو لا بە دڵێکی زۆر خۆش‌و بە سینگێکی زۆر فراوانەوە باوەشیان بۆ کردەوەو زۆر دڵسۆزانە بە دەنگ پێشنیارەکەوە هاتن‌و بە ماوەیەکی کەم ئەم بەرهەمە خنجیلانەیە هاتە کایەوە کە لە دوو تۆی ئەم نامیلکەیەدایەو بەئومێدین

کەلێنێکی بچووك لە کتێبخانەی کوردی پڕ بکاتەوە •

جارێ وا بەشی یەکەمی دەخەینە بەردەستی خوێندەواران و ئەگەر ڕایان لێبووو زانیمان جێگای خۆی لە کتێبخانەی کـوردی دەکاتەوەو توزقالێ سوودی دەبێ ، ئەوە بێهوورە نابین و هەر ناوە ناوە بەشێکی تازەی لێ بڵاودەکەینەوە •

ئیتر دەست لە ناو دەست بۆ خزمەتی ووشەی پاك و ڕەسەنـــی کوردی ، بـــۆ خزمەتی ئەدەب و ڕۆشنبیری پێشکەوتنخوازی کوردی ، لە ئێمە هەرەکەت و لە ئێوەش بەرەکەتی هاندان و پشتگیری •

**عزیز گەردی**

**ئاداری ـ ١٩٨١**

# مـــرواری (١)

**جۆن شتاینبێك (٢)**

**وەرگێڕانی : حاجی ئەحمەد**

[ لە شارا هەقایەتی مرواری‌یە گەورەکە دەگێڕنەوە : (باس دەکەن کە چۆن دۆزرایەوەو چۆن دیسان بزر بوومەوە ، باسی ( کینۆ ) ی

---

(١) John Steinbeck, The Pearl, The Viking Press, Newyork. an. 1978.

(٢) جۆرج شتاینبێك ، سالی ١٩٠٢ لە کالیفورنیا ، لە شاری سالنیاس هاتۆتە دونیاوە · ویستی زیندوەرزانی لە زانکۆی ( ستاندفۆرد ) بخوێنێ بەلام پێی‌تەواو نەکرا · خووی دایە خوێندنەوەو نووسین· یەکەمجار بە هۆی ڕۆمانی ( کێکی‌یان‌و لووس ( Torilla Flat ) ناوبانگی دەرکرد· سالی١٩٦٢ پاداشتی نۆبلی وەرگرتو سالی١٩٦٨ ~~پاداشتی نۆبلی وەرگرتو سالی ١٩٦٨ عەمری خودا کرد~~ کەرکرد ڕۆمانی ( مرواری ـ ( The Pearl ) یش کە بەشی یەکەمی لێرەدا کراوەتە کوردی یەکەمجار بە نـاوی ( مـرواری دنیـا ـ The Pearl of the World ) بلاوکرایەوە ، پاشان لە چاپەکانی پاشتردا کرا بە ( مرواری ) و بەس · ئەم ڕۆمانـە لـە بنـچدا هەقایەتێکی فۆلکلۆری مەکسیکی‌یە ، شتاینبێك زۆر وەستایانە دایڕشتۆتەوەو خستویەتی‌یە قالبێکی هونەری زۆر بەرز !!

ماسگرو) (جوانا)ی ژنیو ( کۆیۆتیتۆ )ی کوڕیە دەکەن • لەبەر ئەوەی ئەم هەڤایەتە زۆر باس کـراوە ڕەگی لەناو مێشکی هەمـوو کەسێك داکوتاوە • ئەم هەموو هەڤایەتانەش کە لەناو دڵی خەڵك دان تەنیا شتی باش‌و خراپ ، شتی ڕەش‌و سپی ، شتی چاك‌و بەدیان تێدایەو لە هیـچ شوێنێك‌دا مام‌ناوەنجی نی‌یە •

ئەگەر بێت‌و ئەم هەڤایەتە ڕەمز بێت ئەوا لەوانەیە هەر کەسەو مانای تایبەتی خۆی لێ‌وەربگرێ‌و ژیانی تایبەتی خۆی تێدا بدۆزێتەوە • هەر چۆنێك بێ لە شارا دەڵێن ] •

( کینۆ ) کە لە خەو هەستا هێشتا سەگ‌و گورگ لێك‌نەدەکرانەوە ، ئەستێرەکان جریوەیان مابوو ، لەلای ڕۆژهەڵاتیشەوە ، ڕۆژ ڕوناکی‌یەکی زەردی لە دامێنی ئاسمان هەڵسوی بوو • بەینەك بوو کەڵەشێر بانگی دابوو • بەرازیش ، کە زوو هاتبوونە دەرێ ، خەریك بوون بێ‌ووچان لق‌و پەلە داریان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکرد بەڵکو پاشماوەیەکیان بە بەردەم بکەوێ بیخۆن • ڕەوە باڵندەیەکی بچووکیش لە دەرەوەی کوختێك ، کە بە دڕك‌و تووتڕك کرا بوو ، جریوەجریویان بوو و باڵیان لێك دەدا •

( کینۆ ) چاوی کردەوەو یەکەمجار تەماشای دەرگای کرد کە وەکو کونێکی چوارگۆشە وا بوو ، ئینجا سەیری ئەو جۆلانەیەی کـرد کـە ( جوانا )ی ژنی وەرگێڕا کە لە تەنیشتی‌یەوە لەسەر حەسیر ڕاکشا بوو ، چارۆکە شینەکەی هاتبووەوە سەر لووت‌و سنگی‌و نەختێ پشتیشی داپۆشی بوو • ( جوانا )ش چاوی زەق بوو ، ( کینۆ ) قـەت بە بیری نەدەهات

جارێ واگا هاتبێو ( جوانا ) وەکو وورشەی ئەستێرەی بچووك وابوو ..
( جوانا ) ئەمجارەیش وەکو هەموو جارەکانی‌دی کە ( کینۆ ) لە خەو هەڵدەستا ، ئاوا چاوی تێ‌بڕی بوو .

( کینۆ ) گوێی لە شڵپەی هێواشی شەپۆلەکانی ئەم بەیانی‌یەی قەراغ دەریا بوو . شتی چاکە ! چاوی داخستەوەو گوێی بۆ ئاوازەکە شل کرد . ڕەنگە بە تەنێ گوێ ڕابگرێ‌وبۆیشی هەیە سەراپای میللەتەکەیشی گوێ ڕابگرن . میللەتەکەی کاتی خۆی گۆرانیبێژی زۆر مەزن بوون . هەر شتێکی بیاندیبایە ، بیریان لێ‌بکردایەوە ، جێ‌بەجێ‌یان بکردایە ، بیانبیستبایە ، یەکسەر دەیانکردە گۆرانی . ئەم گۆرانی‌یانە مابوونەوە ( کینۆ ) دەیزانین ، بەڵام گۆرانی نوێی نەدەهاتە سەرێ . ئەمەش مانای ئەوە نی‌یە هیچ گۆرانی شەخسی نەبوو . دوور نەڕۆین ئەو حەلە (کینۆ) گۆرانی‌یەکی نەرمو ناسکی لە مێشك دابوو ، ئەگەر بیتوانیبایە دەری ببڕێ ناوی دەنا : ( گۆرانی خێزان ) .

( کینۆ ) جاجمەکەی تا سەر لووتی هێنا بوو بۆ ئەوەی شەوبای شێداری پیرە سپیانێ لێ‌ی‌نەدا . خشپەیەکی لە تەنیشتەوە هات، چاوی کردەوە ، دیتی ! جوانا بوو ، ( جوانا ) بە کرو بێ‌دەنگی ڕاست بووەوە، بە پێ خواسی چووە لای جۆلانەی ( کۆیۆتیتۆ ) . داهاتەوە سەری . بە دوو قسەی خۆش زیری کردەوە . ! کۆیۆتیتۆ ) تەماشایەکی سەرەوەی کردو چاوەکانی داخستەوەو نووست .

( جوانا ) چووە کن ئاگردانو مشکی‌ی سەر پەنگرەکانی لاداو نەختێ فووی لێ‌کردو گەشی کردەوەو هەندێ چاوڕۆنکەی هاوێشتە سەر .

ئەوساکە ( کینۆ ) لە خەو هەستاو جاجمەکەی لەسەرو لووتو شانی

لوولدا ، سۆلەکانی بەسەر پێوە کردو چووە دەرەوە بۆ ئەوەی تەماشایەکی کازێوەی بەیان بکا •

لە دەرەوە ، لەسەر چینچکان دانیشتو لچکی جاجمەکەی هێنایەوە سەر ئەژنۆکانی • دیتی هەندێ تیسماڵە هەور لەسەر کەنداوەکەوە لە ئاسمان دەبریسکانەوە • لەو لاوە بزنێك لێی‌نزیك بووەوەو چاوە رەردو ساردەکانی تێ‌بڕی • لە پشتەوەیشی ، ئاگرەکەی ( جوانا ) هەڵاوی لێ‌هەڵدەستاو لە درزی دیواری کوختەکەوە پرووشکی دەهاویشتو ڕوناکی‌یەکی چوارگۆشەی لەرزانی لە دەرگاوە دەناردە دەرێ • پەپوولەیەکی درەنگەوەخت لە دوو شوونی ئاگرەکە چووە ژوورەوە • ( جوانا ) بۆ ئەستوورکە بندانی بەیانی دانی لە دەستاڕ دەکردو دەستاڕەکەش ئاوازی ( گۆرانی خێزان )ی لێ‌هەڵدەستا •

بەیانی زوو هاتو بڕایەوە : سپیاتی ، زەردایی ، ڕۆناکی‌و پاشان کە ڕۆژ سەری لە کەنداو دەرهێنا ئاگرەکە بە تەواوی تەقی‌یەوە • ( کینۆ ) سەری دانەواند تا تیشکی ڕۆژ لە دوڕ چاوی نەدا • تەپەی ئەستوورکەبندانو بۆنی ناو مەقلی دەهات • مێرووی سەر زەوی خەرێك بوون : مێرووی گەورەو ڕەشی ناو قەد سپی ، مێرووی بۆری بچکۆلەی بەبەز • ( کینۆ ) بە بێ‌لایەنی‌یەکی خوایی تەماشای کردن • لەو کاتەدا مێروویەکی بۆر تەنگاو بوو ، هەوڵی دەدا خۆی لەو قۆرتە قومە قوتار بکا کە شێرە مێروویەك بۆی هەڵکەند بوو •

سەگێکی لەڕو دەستەمۆ هاتە لای ( کینۆ ) قسەیەکی نەرمی لەگەڵ کردو سەگەکە گرمۆڵەی کرد • کلکی هێنایە سەر پێیەکانو لمووزی خستە سەرێ • سەگەکە ڕەش بوو ، قانی زەردی زێڕینی بەسەر برۆیانەوە بوو •

ئەم بەیانی‌یەش وەکو هەمـوو بەیانی‌یـەك وا بوو ، بـەڵام لەنـاو بەیانی‌یان بەیانی‌یەکی بێ‌هاوتا بوو •

( کینۆ ) سیرەی گوریسی جۆلانـەی هاتـە بەرگوێ‌و بێ‌ئـەوەی تەماشا بکا ئەوەی هاتە بەرچاو کە ( جوانا ) ( کۆیۆتیـتـۆ )ی لە جـۆلانە دەرهێناو پاکی کردەوەو بەرامپـلـەکەی بۆ وەکو جـولانە هەڵبەسـتو هێنایەوە بەر سینگ‌و بەرۆکی • ( جوانا ) زۆر بە نەرم‌و ناسکی هەڵـی کردە گۆرانی‌یەکی کۆن کە سێ ئاوازی هەبوو بەلام وەستانیان جودا بوو • ئەمەش هەر بەشێکی ( گۆرانی خێزان ) بوو ، بگرە هەمووی بوو جاروبار ئەوەندە بەرز دەبووەوە زێ‌یەکانی گەرووی لەگەڵ دەهاتنە ژان‌و گەرووی دەنووسا • ئەدی ئەمەیـە ناسکی ! ئەمەیـە سۆزو توانـەوە ! ئەمەیە هەموو شتێك !

ئەم ناوە زۆر کوخت‌و کەپری‌تری لێ بوو • ئەوانیش دووکەڵیان لێ‌هەڵدەستا • کە ناشتایان دەکرد دەنگەدەنگی‌یان دەهـات • ئەمانـەش گۆرانی‌دی بوون • ئەم ماڵانە بەرازیان بەرازی‌تر بوو ، ژنیان ( جوانا ) نـەبـوو •

( کینۆ ) گەنجێکی بەوەج بوو • پرچی ڕەشـی هاتبـووەوە سـەر نێوچەوانی ئەسمەری ، چاوەکانی گەرم‌و گەش‌و تیژ بـوون • سـمێڵی زیك‌و باریك بوو ••• لەبەر ئەوەی ڕەشەبا زەهراوی‌یەکە نەماوە تیشکی زێرینی ڕۆژ لە خانووی دەدا ، ( کینۆ ) جاجمەکەی لەسەر لووتی لابردە

لە نزیك تانۆکەکە دوو کەڵەشێر باڵیان لێك‌کردبووەوە ، کورکی ملیان فش کردبووەوە ، خۆیان داهێنابووەوە ، خەریك بوون هەڵمەت بۆ یەکدی بەرن • وای بێتە شەڕ دەبێتە بەزمێکی خۆش ! ئاخر ئەمانە

باپ‌کەی یاری نین • ( کینۆ ) نەختێ سەرنجی لێدانو پاشان چاوی بڕی‌یە ئەو کۆترە کیویلکانەی کە بەرەو گردەکانی ئەم لا دەهاتنو دەبریسکانەوە • دونیا هەمووی بەخەبەر بوو • ( کینۆ ) هەستا چووەوە ناو کوختی خۆیان •

کە لە دەرگاوە پێی هاویشتە ژوورێ ، ( جوانا ) تازە لەبەر ئاگردانی گەشو ڕۆناك ڕاست بووبووەوە ، چوو ( کۆیۆتیتۆ )ی خستەوە ساو جۆلانە • پرچی ڕەشی خۆی داهێنا؛ هۆنی‌یەوەو کردی‌یە دوو کەزیو بە قردێلەیەکی تەنکی سەوز بەستای • ( کینۆ ) چوو لەبەر ئاگردان هەڵکونجا • ئەستوورکە بندانێکی گەرمی لوولداو لە مەرەگەی هەڵێناو خواردی • قومێ شەرابیشی لەسەر کرد ـ ناشتاکەی ئەمە بوو ! ڕۆژی جەژنو ئاهەنگی ئایینی لێدەرچێ کە تا پێ دەکەوت دەیخوارد ، لە ژیانی خۆی ناشتای وای نەکرد بوو • کە ئەو لێبووەوە ( جوانا ) گەڕایەوە لای ئاگردانو ئەویش چێشتی خۆی خوارد • قسەیان زۆر کرد بوو ، پێویستی‌یان بە ئاخافتنی دی نەبوو؛ هەموو گفتوگۆی بەینیان ئەوە بوو کە ( کینۆ ) هەناسەیەکی دڵنیایی هەڵکێشا •

ڕۆژ کوختەکەی گەرم کردبووەوە ، تیشکی ڕۆژ لە درزەکان دەچووە ژوورەوە • تیشکێکیان لە جۆلانەی ( کۆیۆتیتۆ )ی دەدا ، لە گوریسی جۆلانەکەی دەدا :

جوولەیەکی زۆر بچووك سەرنجی بۆ جۆلانەکە ڕاکێشا • تاسانو بوونە بەرد • دووپشکێك هێدی هێدی بەو گوریسەدا دەهاتە خوارێ کە جۆلانەکەی پێ لە ساپیتە بەسترا بوو چزووی لە دوو خۆی ڕادەکێشاو بە چاوترووکانێك کلکی قیت کردەوە • ( کینۆ ) کە هەناسەی هەڵدەکێشا مشمشەی کونە لووتەکانی دەهات ، دەمی قەپات کرد بوو بۆ ئەوەی دەنگی

لێوە نەیە • تاسانەکەبەریداو لەشی گرژی خاو بووەوە سترانێکی نوێی کەوتە کەللە ، سترانی بەدکاری ئاوازی دوژمنداری ، جا هەر دوژمنێکی خێزانەکەی بێ • ئاوازەکــە ئاوازێکی ســەختو نهێنیو ترســناك بوو • ( گۆرانی خێزان )یش لە ژێرەوە بەدەم ئازارەوە زرنگایەوە •

دووپشکەکە بە ئەسپایی بە گوریسەکەدا بۆ لای جۆلانەکــە هاتە خوارێ • ( جوانا ) لە بن لێوان دوعایەکی دێرینی خوێند بۆ ئەوەی ئــەم کۆرپە ساوایە لە ئازاری ئەم دوژمنە بــەدکارە بەدوور بێو لە پۆپــەی دوعاکردندا بە دەم جیرەجیری ددانەکانی خۆی دەخاڵــەتی حــەزرەتی مێرەم کرد • ( کینۆ ) زۆر بە کپی وەستا بوو ، گرێی لە خۆی بڕی بوو ، قۆڵی درێژ کردبووو لەپی دەستی هاتبووە خوارێ ، چــاوی هــەر لەسەر دووپشکەکە بوو کە ( کۆیۆتیتۆ ) بە پێکەنینەوە لەنــاو جــۆلانەکە دەستی بۆ درێژ کرد بوو •

کە ( کینۆ ) لێی‌نزیك بووەوە دووپشکەکە هەستی کرد مەترسی‌یەك هەیە تەکانێکی دایە خۆیو کلکی خستە سەر پشتیو چزوی لاری سەری کلکی بریسکایەوە •

( کینۆ ) لە جێی خۆی ڕەق ڕاوەستا • گوێی لێبوو ( جوانــا ) دوعاکەی دووپات دەکردەوە • ئاوازی بەدکارانەی دوژمنانی هاتەوە بەر گوێ • تا دووپشکەکە نەجوولایەوە نەیتوانی لە جێی خۆی بجوولێتەوە• دووپشکەکە هەستی‌کرد مەرگی نزیك بۆتەوە • ( کینۆ ) بە هێواشی دەستی بۆ درێژ کرد • کلکی چزوداری قیت کردەوە • لەم کاتەدا (کۆیۆتیتۆ) بە دەم تریقانەوە گوریسەکەی هەژاندەوەو دووپشــکەکە بــەربووەوە • ( کینۆ ) دەستی درێژ کرد دووپشکەکە بگرێتەوەو لێنەگەڕێ بەر بێتەوە سەر ( کۆیۆتیتۆ ) بەلام دەستی نەگەیشتیو دووپشکەکە کەوتــە ســەر

شانی کۆرپەکەو پێی‌وەدا • ( کینۆ ) نەڕاندی‌و دووپشکەکەی گـرت‌و ڕایکوشی‌و لەناو دەستی کردی‌یە چلم ، پاشان فڕێی دایە سەر زەوی‌و مستێکی قایمی لێدا • ( کۆیۆتیتۆ ) لەبەر ژانی لەشی ، لەناو جۆلانەکـە زریکەی تێوەستا ( کینۆ ) هەر خەریکی دوژمنەکـەی بوو هـەر لێی‌داو کوتای تا کردی‌یە پشکەئاوێك‌و هیچی‌تر • ( کینۆ ددانی گڕ کردبووەوە ، پرووشکی لە چاوان دەباری‌و گۆرانی دوژمنی لە گوێدا دەزرنگایەوە •

( جوانا ) کۆرپەکەی لە هامێز کرد • جێ چزووەکەی دیتەوە ، کە تا دەهـات سـوور هەڵـدەگەڕا بەبـەر دا دەچـوو ، لێـوی بـە جێ‌چزووەکەوە ناو توند توند مژی‌و تفی کردەوە ، دووبارە دەمی پێوە ناوە ( کۆیۆتیتۆ )ش هـەر هاوار هاواری بوو • ( کینۆ )ش دەگـەڕاو دەسووڕا ، چ جێی پێ جێ نەبوو ، چاری ناچار بوو •

دراوسێکان لەگەڵ زریکزنی کۆرپـەکە هاتن خڕ بوونـەوە • لە کوخت‌و کەپرەکانەوە هـەڵقوڵان‌و هـاتن • ( جوان تۆماس )ی برای ( کینۆ ) بە خۆی‌و بە ( ئەپۆلۆنیا )ی ژنی قەڵەوی‌و هەر چوار منداڵەکانی هاتن لە دەرگا ڕاوەستان ، ئەوانی‌تریش لە پشت ئەوانەوە ڕاوەستا بوون‌و دەیانەویست تەماشای ژوورێ بکەن • منداڵێکی بچووك بەبن دەسـت‌و پێیاندا چوو بۆ ئەوەی سەرنجێك لە ژوورەوە بدا • ئەوانـەی پێشـەوە بەوانەی پشتەوەیان گوت : « دووپشـکە ، دووپشـك بە کۆرپـەکەی وەداوە » •

( جوانا ) نەختێ لە مژینی جێ‌چزووەکە وەستا ، کونەکە نەختێ گەورەتر ببووو دەورو بەریشی لەبەر مژین سپی هەڵگەڕا بوو • ئاوسانیشی زێدە ببوو بگرە ئاوو زلزڵەیشی لێ‌دەهات •

هەموو عالەم بە دووپشکەکەیان زانی • دووپشک بە بنیادەمی گەورە وەبدا شڕی دەکا ، خۆ ئەگەر بە کۆرپەی ناسکو ساوا وەبدا ڕەنگە ئەوەندەی ژەهر تێبکا ، بیکوژێ • دەیانزانی : جێی پێوەدانەکە ئەستوور دەبێ ، تای دێتێ ، گەرووی دەگیرێ ، پاشان سکی ژان دەکاتو ئەگەر زۆر ژەهری چووبێتە لەش ئەوا دەیکوژێ •

ئازاری پێوەدانەکە وورده وورده کەم بووەوەو زریکەو هاواری کۆیۆتیتۆ ش بوو بە نزکەو نالە •

( کینۆ ) سەری لە بەهێزی ژنە ناسکو بەئارامەکەی سوورما بوو • ژنەکەی زۆر گوێڕایەڵو بەڕێزو دەم بەپێکەنینو پشوودرێژ بوو • هەقی بوو ئەگەر لەبەر زانی کۆرپەکەی پشتی بچەمێتەوەو بزریکێنێ ، بەڵام لە ( کینۆ ) زیاتر بەرگەی برسێتیو ماندووبوونی دەگرت • ژنێکی گرانو سەنگین بوو • ئێستا ئەم ژنە قسەیەکی زۆر عاجباتی کرد ، گوتی :

« دختۆر ! بڕۆ دختۆر بێنە ! »

ئەم قسەیە کەوتە ناو ئەو دراوسێیانەی لە حەوشە کەڕەسیەیان کرد بوو ، لە ناوەخۆ دووپاتیان کردەوە :

« ( جوانا ) دختۆری دەوێ ! دختۆر ویستن شتێکی سەیرە ! شتێکی وایە قەت لەبیر ناکرێ ، خۆ ئەگەر دختۆر بێ ئەوە هەر عاجباتییەکی تەواوە ! » •

هەقیان بوو ، ئاخر دختۆر قەت پێی بەم ناوە نەکەوتبوو ، قەت نەهاتبووە ناو ئەم کوختو کەپرانە ، جا چ مەجبوورە دێ ! تا دەوڵەمەندی خاوەنی خانووی بەردو سپیکراوی شار هەبنو بە زیادەوە هەقی

بدەنێ ، نایە !

خەڵکەکە گوتیان : « نایـە ! » •

ئەوانەی بەر دەرگا گوتیان : « نایـە » •

( کینۆ ) تێیان گەیشتو بە ( جوانا )ی گوت :

« دختۆر نایـە ، نا !! »

( جوانا ) چاوی هەڵبڕیو تەماشایەکی کرد • چاوی سارد وەکو چاوی دەڵەشێر وا بوون • ئەمـە نۆبەرەیـەتی ! هەمـوو شـتێکی ئـەم دونیایەتی ! •

( کینۆ ) هەستی بە سوور بوونی ناو چاوەکانی ( جوانا ) کـردو ( گۆرانی خێزان ) بە سازو ئاوازێکی ئاسنینەوە لە کەللـەی سـەریدا دەنگی دایەوە •

( جوانا ) گوتی : « ئەو نایە ئێمە دەچینە لای ! » بـە دەسـتێك چارۆکە شینو تارەکەی سەرسەری ڕێكخستو لچکێکی کردە جۆلانەو کۆرپەکەی خستە ناوێ ، کە لەبـەر نزگران سـەری هـەڵدەقـەنا و لچکەکەی بۆ کردە سێبەر تا هەتاو لە چاوی نەدا ••• ئەوانـەی بـەر دەرگا دڕیان بەوانەی پشتەوە داو ڕێیان بۆ کردەوە • ( کینۆ ) کەوتە شوێنییەوە • هەموو دراوسێکان کەوتنە شوێنیانەوە• مەسەلە مەسەلەی دراوسێتییە !! کۆڕەوێکی پەلەو تەنگاویان بـەرەو شـار پێك هێنـا • ( جوانا ) و ( کینۆ ) لە پێشەوە دەڕۆیشتن ، ئینجا ( جوان تۆماس )و ( ئەپۆلۆنیا ) کە سکی وەکو فەردە زەهیر وا بوو لەگەڵ هەنگاونانیدا دەلەرییەوە • ئینجا هەموو دراوسێکان ، ڕێچکەیان بەستبوو ، لەم بەرو لـەو بەری ڕێـگاش منداڵ غارغارێنێیـان دەکـرد • بەرووەسێبەر

دەڕۆیشتن ، ڕۆژی زەرد لە پشتی دەدان‌و سێبەری ڕەشیان دەکەوتەوە پێش •

گەیشتنە شوێنێك کوخت‌و کەپر نەمان‌و شاری بەردو گەچ دەستی پێ‌کرد • هەموو خانووەکانی شار دیواریان بەرد بوو ، باخچەی فێنکیان لێ‌بوو ئاوی لێ‌هەڵدەقولا ، گوڵی سوور دیواریان داپۆشی بوو ، دیوارەکانیش لە کەربووچی سوورو سپی بوون • لە حەوشان دەنگی باڵندەی ناوقەفەز دەهات • ئاوی گەرم لەسەر بەردی مەڕمەڕ شلپ‌و هۆڕی بوو •

کوڕەوەکە گوڕەپانە تەسکەکەی بڕی‌و دایەوە پێش کلێسا • کوڕەوێکی زۆر گەورە بوو ! لە پەرگەی ئاوەدانی ، ئەوانەی تازە هاتبوونە شار ، کە زانی‌یان دووپشك بە کوڕەکەی وەداوەو دایك‌و باوکی خەریکن بە هێمنی دەیبەنە لای دختۆر ، بەگەڵیان کەوتن •

ئەوانەی تازە هاتبووتە شار ، بە تایبەتی دەرۆزەکەرەکانی بەردەرکی کلێسا ، کە لەبارەی ئابووری‌و دارایی‌یەوە شارەزایی‌یان هەبوو ، هەر زوو زوو لە تەنوورەی شینی کۆنی ( جوان )و لە چارۆکەی دڕادڕاو لە قردیلەی سەوزی کەزی‌یەکانی‌و لە جاجمە شڕو کۆنەکەی ( کینۆ )و لە جل‌و بەرگی بەری کە هەزار جار شوورا بوو ، زانی‌یان کە ئەمانە دەست کورتن‌و ئیدی کەوتنە شوێنی‌یانەوە بۆ ئەوەی بزانن چ مەرگەساتێکیان لەپێشەو ئەنجامیان بە چی دەگا ! چوار دەرزۆزەکەر لەبەر دەرکی کلێسادا هەبوون ، هەموو شتێکی ئەم شارەیان دەزانی • ژنی جاحێڵیان دەدی دەچوون پێ لە تاوانی خۆیان بنێن • ئەمانە هەموو شتێکی ووردیان دەزانی‌و ئاگایان لە زۆر تاوانی گەورەش بوو • لەبەر سێبەری کلێسادا پاڵیان دەداوە هەر کەسێ بچووبایە کلێسا دەیاندی •

دختۆریشیان باش دەناسی • شارەزای نەزانیو بەدکاریو چاوچنۆکیو ڕژدیو تاوانەکانی بوون • دەیانزانی چەند بە خەشیمی منداڵ لەبەر ژنان دەباتو چەند ڕەزیلو چاوچنۆکەو چۆن تا فلووسێکی سوور دەکاتە خێر بەرد بە کەرتك دەبێ • زۆر کوشتەی دەستی دختۆریان دەدی دەیانبردنە کلێسا • جا لەبەر ئەوەی ئەوسا نۆیـژی بەیانـی کـرابوو ، ئیشیش کەم بوو • ئەوانیش کەوتنە شوینی کۆڕەوەکە ، شوێنی ئـەو حەشامەتەی کە هەستییان بە دەردی هاوڕێکەیان دەکرد ، بۆ ئـەوەی بزانن داخۆ دختـۆری قەڵـەو چ لـەو کۆرپەیە دەکا کە دووپشـك پێیوەداوە •

ئەنجام کۆڕەوی بەلەزوبەز گەیشتە بەر قەنتەرەی ماڵی دختۆر • شڵپەی ئاوو خوێندنی تەیری ناو قەفەزو خشەی گەسکی دەسكدرێـژی سەر مەڕمەڕ دەهات • ماڵی دختۆر بۆنی گۆشـت بـەرازی بـرژاوی لێدەهات •

( کینۆ ) هەڵوەستەیەکی کرد ــ ئەم دختۆرە لە خۆیان نییە ، ئەم دختۆرە لە ڕەگەزێکی وایە ئەوە نزیـکەی (٤٠٠) ساڵـە ڕەگەزی ( کینۆ ) دەچەوسێنێتەوەو برسی دەکاتو تاڵانی دەکاتو سووکایەتی بەسـتەزمانەی بـە ناچـاری پێی بـە جـەرگی خۆیـەوە نـاو چووە کـن دەرگـا • ئـەم جارەشـ وەکـو هـەمـوو جارێـکیتر کـە لە کابرایەکی ئەم ڕەگەزە نزیك دەبووەوە هەستی بە ترسو تووڕەییو بێهێزی کرد • ترسو تووڕەییەکەی پێکەوە بوون • لەبەر ئەوەی هەموو ڕەگەزی دختۆر ڕەگەزی ( کینۆ )یان بە حەیوان دەزانی ، (کینۆ) دختۆرکوشتنو قسە لەگەڵ کردنی بەلاوە وەکو یەك وا بوو •

(کینۆ) کە دەستی ڕاستەی بۆ ئەڵقەی ئاسنی دەرگاکە بەرز کردەوە،

تووڕەیی لەناوەوەی پێچی کردو جۆشی سەند ، ئاوازی سەختی دوژمنانی لە گوێدا زرنگایەوە ، توند لێوی خۆی کرۆشت ـ بەڵام بە دەستی چەپە تەپڵەی لەسەر کردەوە • تەقەی لە ئەلقە ئاسنەکەی دەرگا هەستاند ، بە سەرکوتی چاوەڕێی کرد • ( کۆیوتیتۆ ) لە باوەشی ( جوانا )دا نووزاندی ، ( جوانا ) بە نەرمی ژیری کردەوە • کوڕەکە زیاتر هورووژمی بۆ بەر دەرگا هێنا تا باشتر ببینن و باشتر گوێیان لە قسان بێ • دوای نەختێ ، دەرگا گرێیەك کرایەوە • ( کینۆ ) لە درزی دەرگاوە شینایی باخچەی فێنك و فیچقەی ئاوی لێدەرکەوت • یەکێکی لە ڕەگەزی خۆیان سەری لە دەرگا هەڵکێشا • ( کینۆ ) بە زمانی دێرین و زگماکی خۆیان پێی گوت :

« ئەم کۆرپەیە نۆبەرەمانە ، دووپشك پێی وەداوە ، دختۆری دەوێ ! »

دەرگا نەختێ وێکهاتەوە ، نۆکەرە بە زمانی دێرینی خۆیان نەدوا ، گوتی :

« ڕاوەستە با بچم ، بزانم ! ! » •

دەرگای پێوەداو شمشێرەی ڕەپێش کرد • تیشکی ڕۆژ سێبەری خەڵکەکەی بەرەو پاش خستبووە سەر دیوارە سپییەکە •

دختۆر لە ژووری خۆی لەسەر چوارپایەیەکی بەرز دانیشتبوو ، ڕۆبێکی ئاوریشمی سووربای پاریسی لەبەربوو کە قۆپچەکانی دادەخست سەرسنگی تەسك دەبووەوە • سینییەکی زیوی لەسەر کۆشی دانابوو ، قووتوویەك کاکاوو فنجانێکی تەنکی قەپێلکە هێلکەی چینی لەسەر بوو ، ئەوەندە تەنك و ناسك بوو هەر ئەوەتە دەتدی • دختۆر بە سەری

( پەنجـە گەورە )و ( شـادە نوێـژە )ی دەسـتی زلی دەیـگرتو سـێ پەنجەکەی تری لێ دووردەخستەوە • دختۆر کابرایەکی چوارشانە بوو ، ئەوەی دەفەی شان بوو ، چاوی لەناو پلە گۆشتێکی فووکراوەوە بە قووڵدا چووبوون ، لچی بە بێزەوەری شۆڕ بووبووەوە ، دەنگی نێرو گڕ بوو ، بەرغەبابەی داکەوتبوو و توند گەرووی دەگوشی • زەنگێـکی بچووکی ڕۆژەلاتیو قووتوویەکی جگەرەی لەسەر مێزی تەنیشت خۆی دانا بوو • کەلوپەلی ناوماڵێ زۆر بە بریقو باقو هەیتو هووت بوون•وێنەکانی سەر دیوارەکان وێنەی ئاینی بوون• وێنەیەکی گەورەو کالی ژنی ڕەحمەتیشی هەڵواسی بوو کە ئەگەر بهاتبوایە نوێژکەرەکان بابی ئەو پارەی لە پاشی بەجێ مابوو دوعاو نوێژیان بۆ بکردایە ، دەچووە بەهەشت •

دختۆر کاتی خۆی ئەم دونیا فراوانە زۆر گەڕا بوو ، بەم دوایییەش سەراپای ژیانی یادو بیرەوەری فەڕەنسا بوو • دەیگوت : « ئەدی ئەوەیە ژیانی شارستانی !! » مەبەستی لەوە دەهات کە توانی بووی بە پارەیەکی کەم لەگەڵ کچی جوان جوان ڕاببوێرێو لە چێشتخانەکان نان بخـوا • دختۆر دووەم فنجانە کاکاوی تێکردو پەنجەی برد پارچـە پسکوێتێکی شیرینی هەڵگرت • نۆکەرەکە دەرگای کردبووەوەو لەبەر دەرگا ڕاوەستا بوو تا دختۆر دەیبینێو قسەیەکی لەگەڵ دەکا • دختۆر گوتی :

( هـــا ! ! » •

« هیندۆکێـکە کوڕیەیەکی هێناوە دووپشك پێیەوە دلوە ! » •

دختۆر تاقینی نەجۆشا بوو بە ئەسپایی فنجانەکەی دانا :

« ئیشم نییە بچم خۆم بە منداڵە هیندۆکانەوە خەریك بکەم ! ! چییە

دووپشك پێیەوە داوە : من دختۆری بنیادەمانم خۆ دختۆری وولاغان نیم » •

نۆکەرەکە گوتی : « بەڵێ وایە ، گەورەم ! » •

دختۆر لێی‌پرسی : « پارەی هەیە ؟ نەخێر ، پارەی لە کوێ بوو ! لەم دونیایەدا دەبێ تەنیا من بەلاش ئیش بکەم ، وەڕس بووم !!! ئا دەی بڕۆ بزانە چ پارەی هەیە ؟! » •

نۆکەرەکە نەختێ دەرگای قەتەرەی کردەوە ، تەماشای حەشامەتە چاوەڕێ‌کەی کرد • ئەمجارەیان بە زمانی دێرین‌و زگماکی خۆیان هاتـە دوان « پارەتان هەیە بیدەنە هەقی چارەکردنی ! » •

( کینۆ ) دەستی بردە بن جاجمەکەی بەری ، کاغەزێکی لە لۆچێك دەرهێنا • کاغەزەکە چەند جارێك نووشتابووەوە • چین چین لێکی‌کردەوە تـا هەشت دنکە مرواری بچووك دەرکەوتن ، وەکو پفکە پیس‌و ناشیرین بوون ، سوا بوو ، نەدەچووە • نۆکەرەکە کاغەزەکەی وەرگرت‌و دەرگای داخستەوە • ئەمجارەیان زۆری پێ‌نەچوو هاتەوەو هەر بای ئەوە دەرگای کردەوە کاغەزەکەی پێ ڕەت‌کردەوەو گوتی :

« دختۆر لێرە نی‌یە بە ئیشێکی گرنگ دەرچووە » •

خێرا بەبێ شەرمی دەرگای داخستەوە •

ئەوسا ، سام‌و شەرمێکی گران خەڵکەکەی داگرت • هەموو بوونە یەك دڵۆپە ئاو • دەرۆزەکەرەکان چوونەوە بەر دەرگەی کلێسا ، وەگەڵ وەگەڵەکان پەرتەیان کرد ، دراوسێ‌کانیش ڕۆیشتن بۆ ئەوەی (کینۆ) شەرمەزار نەکەن •

( کینۆ ) ماوەیەکی زۆر لەبەر دەرگا ڕاوەستا ، ( جوانا )ش لـە تەنیشتی‌یەوە ڕاوەستا بوو • تەپڵەکەی خستەوە سەر سەری ، بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ هەتا هێزی تێدا بوو کوڵەمستێکی لە دەرگا داو بـــە شلەژاوی‌یەوە سەری خوارکردەوەو تەماشای گەیەکانی پەنجـەی دەستی کرد ، فرکۆ هۆڕ خوێنیان لێ دەچۆڕایەوە •

# نووسراوی سەرگۆڕێك (١)

**نووسینی : ڤاختانگ ئەنانیان**
**وەرگێڕانی : حەسەن حوسێن**

لە گەلی‌یەکی زنجیرە چیای ( ئاسلی ) ، لە ناوچەی ( ڤید )ی سەرسنووری ئێران ، بەردێکی نەختێ گەورە لە کەناری ڕووبارێك هەیە •

چەند ساڵێ لەمەوبەر ، یەکێ نووسینێکی لەسەر ئەم بەردە هەڵکەندووە تا ئێستاش بە چاکی دەخوێندرێتەوە، ڕۆژگار نەیسڕیوەتەوەو دیارە نایشیسڕێتەوە •

خەڵکی دەوروبەری ئەم چیایە ئەفسانەیەك لەبارەی ئەم بەردە دەگێڕنەوە ، دەڵێن گوایە کابرایەك لە ژێر ئەم بەردە نێژراوە بەڵام کەس ناوی لەیاد نەماوە • کاتی خۆی ڕاوکەرێکی بەناوبانگ بوو هیچ باڵندەو دڕندەیەك لەبەر دەستی قوتار نەدەبوو بەڵام لەبەر ئەوەی چاوچنۆكو بەرچاوتەنگ بوو هیچ پشوودانی نەدەزانی •

جارێکیان بە ژنەکەی گوت : « ئەمن بە کوشتنی بزنەکێوییان دڵم داناکەوێ ، دەمەوێ بە زیندوویی بیانگرم ! » •

---

Vakhtang Ananyan : The Steep Paths. PP. 164-6. (١)

چووه شاخانو نێری‌یه کێوی‌یه‌کی شاخ زلی کوشتو کەوڵی کردو چووه ناو کەوڵه‌کەی‌و وای لێ‌هات کەس نەیدەزانی نێری‌یه کێوی نی‌یه• که خۆی بەم چەشنه گۆڕی به دزه دزه له کێوی‌یەك نزیك بووەوه •
ئەو ڕۆژه دونیا تەم‌و مژ بوو ، له کێوی‌یەکان نزیـك بووەوه ، ئەوانیش له فێڵی نەدەگەیشتن ، هەر هێندەی ما بوو بکەوێته ناو ڕەوه‌کەو دەستی خۆی بوەشێنێ ؛ لەو کاتەدا ڕێ‌کەوت وا بوو ڕاوکەرێکی‌تریش له چیای ( ئاسلی ) دەسووڕایەوه • تفەنگی بـه دەستـەوه بـوو • که چاوی بەو نێری‌یه گەورەیه کەوت زۆر شادو دڵخۆش بوو • له دڵی خۆی‌دا گوتی :

« ئەم کێوی‌یه زۆر زله به گوللەیەك ناکەوێ ! » •

ئەوه بوو دوو گوللەی گەورەی خسته بەر تفەنگەکەی‌و ئاگری دا• هاوارێکی ترسناك له هەوادا دەنـگی دایەوه • ڕاوکـەر رایکردە سەر نێچیرەکەی ـ بینی کابرایەکه خەڵتانی خوێن بووه •

ڕاوکەرەکه سامی لێ‌نیشت‌و هاواری کرد :

« ئەوه تۆ چیت له خۆت کردووه ؟ تـۆ بۆچی منـت تووشی ئـەم تاوانـه کرد ؟ » •

کابرای ناو پێستی نیری‌یەکه بەسەرهاتی خـۆی بـۆ گـێڕایەوەو گیانی دا •

ئیتر کابرایان له دەم ڕووبارەکه ناشت‌و ئەو ڕاوکەرەی که کوشتبووی ئەم نووسینەی لەسەر کێلی گۆڕەکەی هەڵکەند :

« ئەوەی پێستی خۆی بگۆڕێ دوو گوللەی به دڵ دەکەوێ » •

بەردەکه ئێستاش له دەم ڕووبارەکەیەو هەمـوو جـارێ که بۆ ڕاو دەچمه ئەم گەڵی‌یه نووسینەکەی سەری دووباره دەخوێنمەوه •

# ڕاستی دەشاردرێتەوە بەڵام بزر نابێ (١)

نووسینی : تۆلستۆی
وەرگێڕانی : نەوزاد تەقیەدین

بازرگانێکی گەنج لە شاری ( ڤلادیمیر ) هەبوو ناوی ( دیمیتریچ ئەکسیۆنۆف ) بوو • دوو دوکانو خانوویەکی هەبوو •

ئەکسیۆنۆف کابرایەکی کۆکی سیسو سەر بە گڵوازە بوو • ڕووی خۆش بوو • زۆر حەزی لە گۆرانی دەکرد • بە گەنجی ئاژاوەچیبوو ، زۆری دەخواردەوە بەڵام کە ژنی هێنا ئەگەر جاروبار ، دەنا نەیدەخواردەوە •

هاوینێکیان ، ئەکسیۆنۆف ویستی بچێتە ( پێشانگای نیژنی )و کە

---

(١)
The Pocket Book of Short Stories. Edited by : M. E. Speare. P.P. 332-40.

لەئینگلیزیەکەدا ناونیشانی چیرۆکەکە ئەمەیە :

(( God Sees the Truth, But Waits )).

واتە : « خوا ڕاستی دەبینێ بەڵام چاوەڕێ دەکا » •

مالآوایی کرد ژنەکەی پێی گوت : « ئیڤان دیمتریف ، ئەمڕۆ مەڕۆ ، خەونێکی ناخۆشم بە تۆوە دیوە ! » •

ئەکسیۆنۆف پێکەنیو گوتی : « دەترسی نەوەك کە چوومە پێشانگا دەست بە ڕابواردنو خواردنەوە بکەم ؟ ! » •

ژنەکەی وەڵامی دایەوە : « نازانم چ ترسێکە لێم پەیدا بووە ، هەر ئەوەندە دەزانم خەونێکی ناخۆشم دیوە • لە خەونێ دیم کە لە شار گەڕایتەوەو شەپقەت لە سەر کردەوە سەرت ماشو برنج بووبوو » •

ئەکسیۆنۆف پێکەنیو گوتی : « خەونی خێرێیە ، بزانە چۆن هەموو کەلوپەلەکانم دەفرۆشمو لەو پێشانگایە دیاریت بۆ دێنم » •

مالآوایی کردو ڕۆیشت •

لەنیوەی ڕێگا تووشی بازرگانێکی ناسیاوی هات ، شەو پێکەوە چوونە یەك خان ! پێکەوە چایان خواردەوەو شەو هەر یەکە چووە ژوورێك ، ژووریان لە تەنیشت یەك بوو •

ئەکسیۆنۆف عادەتی نەبوو درەنگ بخەوێ • لەبەر ئەوەی بە هیوا بوو بە فێنکێ ڕێ بکا پێش بەیانی عارەبانچییەکەی لەخەو هەستاندو پێی گوت ئەسپەکان ئامادەبکە • ,

ئینجا چووە لای خاوەنخان ( کە لە پشتەوە لە کوخێلێدا بوو )و کرێی خۆی داو چووە ڕێگای خۆی •

کە ( ٢٥ ) میل ڕۆیشت ، ڕاوەستا بۆ ئەوەی ئەسپەکان ئالیك بدا •

ئەکسیۆنۆف لە هەیوانی خانەکە پشوویەکی داو پاشان چووە سەر بالکۆنو فەرمانی دا سەماوەر جۆش بدەنو گیتارەکەی دەرهێناو کەوتە

گیتار لێدان •

لەناکاو عارەبانەیەکی بەزەنگوڵە هات ، ئەفسەرێکی پۆلیسی لێدابەزی دوو سەربازی لە دوو بوو • هاتە لای ئەکسیۆنۆفو لێی‌پرسی : تو کێی ؟ و کەی هاتووی ؟ •

ئەکسیۆنۆف هەمووی وەلام دایەوەو گوتی : « فەرموو چایەکم لەگەڵ بخۆرەوە » • بەلام ئەفسەرەکە هەر بەردەوام بوو لە پرسیار کردن • لێی‌پرسی :

« شەوی ڕابردوو لە کوێ بووی ؟ بە تەنێ بووی یان چ بازرگانت لەگەڵ بوو ؟ ئەم بەیانی‌یە بازرگانەکەی‌ترت دی ؟ بۆچی پێش بەیانی خانەکەت بەجێ‌هێشت ؟ » •

ئەکسیۆنۆف سەری سوڕما بوو ؛ بۆچی ئەم هەموو پرسیارانەی لێدەکات بەلام بە ووردی هەموو شتێکی بۆ باس کردو پاشان گوتی :

« بۆچی ئەم پرسیارانەم لێدەکەی ؟ وا دەزانی دزو جەردەم ؟ من ئیشی خۆمم هەیە پێویست ناکا ئەم پرسیارانەم لێبکەی ؟ » •

ئەفسەرەکە سەربازەکانی بانگ کردو گوتی : « من ئەفسەری پۆلیسی ئەم ناوچەیەم ، بۆیەش ئەم پرسیارانەت لێدەکەم چونکە ئەو بازرگانەی دوێنێ شەو لەگەڵ تۆدا بوو ، ئەم بەیانی‌یە تەماشا دەکەن گەرووی هەڵبڕاوە ! جا ئێستا دەبێ کەلوپەلەکانت بپشکنین ! » •

چوونە ژوورەوە ، ئەفسەرەکەو دوو سەربازەکە جانتای ئەکسیۆنۆفیان کردەوەو پشکنی‌یان • لە هیکەوە ئەفسەرەکە چەقۆیەکی لەناو جانتایەك دەرهێناو هاواری کرد : « ئەم چەقۆیە هی کێیە ؟ » •

ئەکسیۆنۆف تەماشای کردو کە ئەم چەقۆیە بەخوێنەی لەناو جانتاکە دی زۆر ترسا •

ــ « ئەم چەقۆیە بۆ بە خوێن بووە ؟ » •

ئەکسیۆنۆف ویستی وەڵام بداتەوە بەڵام قسـەی پێنەکرا • بـە زمانلەنگی‌یەوە گوتی : « من ــ نازانم ــ هی من نی‌یە ! » •

ژووری بازرگانەکە دەبینن گەرووی هەڵبڕاوە • هەبی‌ونەبێ تۆ کوشتووتە • خانەکە لە ژوورێ کلیل درا بوو ، لە تۆ زیاتر کەس لەوێ نەبووە • ئەوەتا چەقۆی بەخوێنیش وا لەناو جانتاکەتە • لە دەمو چاوو هەڵس‌وکەوتیشـتڕا دیارە • پێم‌بڵێ چۆنت کوشـتو چەنـدت پـارە لێ‌دزیوە ؟ » •

ئەکسیۆنۆف سوێندی خوارد کە ئەو نەیکوشـتووە لــە کـاتی چاخواردنەوە بە دواوە چاوی پێنەکەوتووەو لە هەشت هــەزار ڕۆبلی خۆی زیاتر هیچی‌پێ‌نی‌یەو ئەم چەقۆیەش هی ئەو نی‌یە • بەڵام دەنگی نووسا بوو ، ڕەنگی هەڵبزڕکابوو ، وەك تاوانباران لە ترسان دەلەرزی •

ئەفسەرەکە فەرمانی بە سەربازەکاندا ئەکسیۆنوفیان قۆڵبەسـت کردو خستیانە ناو عارەبانەیەك • ئەکسـیۆنۆف نیشانەی خاچی کێشاو لە پرمەی گریانی دا • پارەو کەل‌وپەیان لێ‌سەندو ناردیانە نزیکترین شارو خستیانە بەندیخانە • لە شاری ڤلادیمیر پرسیاریان کرد داخـۆ ڕەوشتو هەڵس‌وکەوتی چۆنە • بازرگانەکان‌و خەڵکی شـار گوتیان : هەر چەندە ئەم کابرایە کاتی خۆی دەیخواردەوەو وەختی خۆی بــە فیرۆ دەدا بەڵام پیاوێکی باشــە •

ڕۆژی مەحکەمەی هات : تاوانباریان کرد کە بازرگانێکی ڕیازانی

کوشتووەو بیست هەزار ڕۆبلی لێدزیوە •

ژنەکەی لێی بێئومێد بوو • قەت دڵی بڕوایی نەدەدا شتێ وا ڕاست بێ • منداڵەکانی هەموو سەرکەوبنکە بوون ، یەکێکیان لەبەر مەمکان بوو • هەموو منداڵەکانی بردو چووە ئەو شارەی مێردی لێ گیرا بوو • یەکەمجار نەیانهێشت مێردی ببینێ بەلام کە زۆر پاڕایەوە لێپرسراوەکان دڵیان نەرم بووو بردیانە لای • کە دیتی مێردەکەی بەرگی بەندیخانەی لەبەرەو کۆتو زنجیر کراوەو لەگەڵ دزو تاوانباران لە ژوورێ کراوە ، یەکبیەر کەوتو لە هۆش خۆی چوو ، تا ماوەیەکی زۆر نەهاتەوە سەر خۆ • کە وەخۆ هاتەوە منداڵەکانی ڕاکێشا لای خۆیو لە نزیك مێردەکەی دانیشتو باسی ماڵەوەی بۆ کردو لێیپرسی داخۆ بۆچی وای بەسەر هاتووە • کابرا هەمووی بۆ گێڕایەوە • ژنەکە گوتی : « ئێستا چ بکەین ؟ » ـ «دەبێ سکالا بەینە بەر قەیسەر کە لێنەگەڕێ کابرایەکی بێتاوان لەناو بچێ » •

ژنەکە گوتی : « سکالام پێشکەش کردووەو قبووڵ نەکراوە • »

ئەکسیۆنۆف وەلامی نەدایەوە ، بەکزی سەری دانەواند •

ئینجا ژنەکەی گوتی : « بەلاش نەبوو لە خەودا دیم سەرت ماشوبرنج بووە ! لە بیرتە !! » •

پاشان دەستی بە پرچی مێردی داهێناو گوتی : « ڤانیای ئازیز ، ڕاستی لە ژنی خۆت مەشارەوە ، تۆ نەتکوشتووە ؟! »

ئەکسیۆنۆف گوتی : « دیارە هەتا تۆیش گومانم لێدەکەی • »

دەستی بە دەم وچاوی‌یەوە گرت‌و لە پرمەی گریانی دا لەو کاتەدا سەربازێك هات‌و بە ژنەکەی گوت بە خۆی‌و بەمنداڵەکانی‌یەوە بڕوا • ئەکسیۆنۆف دوا ماڵاوایی لەو ماڵ‌و منداڵە کرد •

کە ڕۆیشتن ئەکسیۆنۆف بیری لە قسەکان کردەوەو کە بە بیری هاتەوە ژنەکەیشی لێی بە گومانە ، لە دڵی خۆی‌دا گوتی : « وا دیارە تەنیا خوا ئاگای لە ڕاستی‌یەو دەبێ هەر لەو بپاڕێینەوەو چاومان هەر لە ڕەحمی وی بێ » •

ئەکسیۆنۆف هیچ سکاڵای‌تری نەنووسی ، بە تەواوی ئومێدی بڕا ، هەر ئەوەندەی ما بوو لە خوا بپاڕێتەوە •

ئەکسیۆنۆف حوکمی درا کە بە قامچی‌سەربەگرێ قامچی‌کێش بکرێ‌و بنێردرێتە کانزاکان • ئەوەبوو کە قامچی کێش کراو برینی گرێ‌یەکان ساڕێژ بوون لەگەڵ تاوانبارەکانی‌تر ڕەوانەی سیبریا کرا •

ئەکسیۆنۆف (٢٦) ساڵ بە تاوانبارکراوی لە سیبریا مایەوە • سەری وەك بەفر سپی بوو ، ڕدێنی تەنك‌و ماش‌و برنج بوو ، گاڵتەو پێکەنینی جارانی نەما ، پشتی چەماوە ، ڕۆیشتنی لەسەرەخۆ بوو ، کەم دەدوا ، قەت پێ‌دەکەنی بەڵام زۆر نوێژی دەکرد •

ئەکسیۆنۆف لە بەندیخانە فێری پێڵاو دروست‌کردن بوو ، هەندێ پارەی پەیدا کردو ( ژیانی پیرەمێردان ) ی پێ کڕی • کە بەندیخانە ڕوناك بوایە دەیخوێندەوەو یەك شەموانیش لە کلێسای بەندیخانە دەرزی دەخوێندو لەبەر ئەوەی دەنگی هێشتا خۆش بوو لەگەڵ کۆرس‌دا سرودی ئایینی دەخوێندەوە •

سەبارەت بەوەی کە ئەکسیۆنۆف کابرایەکی هێمن‌و لەسەرەخۆ بوو

هەموو لێپرسراوانی بەندیخانە خۆشیان دەویستو گیراوەکانیش ڕێزیان دەگرتو ( بابەگەورە )یان ( پیر ) یان پێدەگوت • کە بیانویستایە سکاڵای شتێ لای لێپرسراوانی بەندیخانە بکەن ئەکسیونۆفیان دەکردە دەمڕاستو کە بەینیان تێکبچووبایە دەهاتنە لای ئەو پێکیان بێنێتەوە •

ئەکسیۆنۆف هیچ دەنگوباسی ماڵەوەی نەدەزانی ، تەنانەت نەیدەزانی داخۆ ژنو منداڵەکانی ماون یان مردوون •

ڕۆژێکیان تاقمە تاوانبارێکی نوێ هاتنە بەندیخانە • ئێوارە گیراوەکۆنەکان لە دەوری نوێکان گرد بوونەوە ، لێیان پرسین هی چ گوندو چ شارێکنو لەسەر چی گیراون • ئەکسیۆنۆفیش بە خەمباری لە نزیك گیراوە نوێکان دانیشتبووو گوێی ڕاگرتبوو •

یەکێ لە تاوانبارەنوێکان ، کە کابرایەکی درێژو بەتینی شەست ساڵی بوو ، ڕدێنی ماشو برنج بوو ، تازە سەرو قەڵەمی کرد بوو ، بۆ ئەوانەی دی دەگێڕایەوە کە لەسەر چی گیراوە ، دەیگوت :

« برادەرینە ! من هەر ئەوەندەم کرد بوو ئەسپم لە عارەبانە کردبووەوە بۆ ئەوەی سواری بمو زوو بگەمەوە ماڵێ • دامنا بوو پاشان بەرەڵلای بکەم • عارەبانچییەکە برادەری خۆیشم بوو کەچی منیان گرتو گوتیان : دزیوتە •

گوتم : نەمدزیوە •

بەڵام چۆنم دزیوەو لە کوێم دزیوە ؟

نەیاندەزانی ••• کاتی خۆی تاوانێکی بەڕاستیم کرد دەبوایە ئەو حەلە بمگرنو بمهێننە ئێرە بەڵام ئەوسا نەیانزانی تاوانبارەکە منمو نەیانگرتم، کەچی ئێستا هیچم لەسەر نییە لە ختو خۆڕایی گرتوومیان

ئاخ ! بەڵام درۆم لەگەڵ کردن • پێشتریش ڕەوانەی سیبریایان کـردم بەڵام زۆر نەمامەوە • »

یەکێ لێی‌پرسی : « تۆ خەڵکی کوێی ؟ »

ـ « خەڵکی ڤلادیمیرم • ماڵم لەوێیە • ناوم (ماکار)ەو (سمیۆنیچ) یشم پێ‌دەڵێن • »

ئەکسیۆنۆف سەری بەرزکردەوەو گوتی : « ســمیۆنیچ ، هیـچ لەبارەی خاوو خێزانی ئەکسیۆنۆفی بازرگانی ڤلادیمیر نازانی ؟ ئەرێ مـاون ؟ »

ـ « هەڵبەتە دەیانناسم • دەوڵەمەندن • بەڵام باوکیان لە سیبریایە • دیارە وەکو خۆمان تاوانبارە • ئەدی تۆ ، بابەگەورە ، تۆ چۆن کەوتیتــە ئێــرە ؟ »

ئەکسیۆنۆف پێی‌خۆش نەبوو بەدبەختی خۆی بگێڕێتەوە ، تەنیـا هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی : « ئەوا بیســتو شــەش ساڵە لەســەر تاوانەکانم بەنــدم • »

ماکار سمیۆنیچ پرسی : تاوانەکە چ بوو ؟

ئەکسیۆنۆف هەر ئەوەندەی گوت : « بەڵێ بەڵێ ، دیارە هەقەمست بوویم • » هیچی‌ترت نەگوت بەڵام هاوڕێکانی بۆ گیراوەنوێکانیــان گێڕایەوە کە ئەکسیۆنۆف بۆچی هێنراوەتە سیبریاو چۆن یەکێ چــووە بازرگانێکی کوشتووەو چەقۆبەخوێنەکەی لە ناو کەل‌وپەلی ئەکسیۆنۆف داناوەو بە غەدر ئەکسیۆنۆفیان حوکم کردووە •

کە ماکار سمیۆنیچ ئەمەی بیست ، تەماشایەکی ئەکسیۆنۆفی کرد،

شەبی لە چۆکی خۆی‌داو گوتی :« بەخوا سەیرە ! سەیر هەر وا دەبێ ! ئەدی بۆ وا پیر بووی ، بابە گەورە ؟ ! •

خەڵکەکە لێیان‌پرسی بۆ وا سەرسام بووەو پێشتر ئەکسیۆنۆفی لە کوێ دیوە ؟ بەڵام ماکار سمیۆنیچ وەڵامی نەدانەوە • هەر ئەوەندە بوو گوتی : « براینە ، سەیرە کە لێرە تووشی یەك بووین ! »

لەم قسانە ئەکسیۆنۆف گومانی پەیدا کرد کە ئەم کابرایە دەزانێ کێ بازرگانەکەی کوشتووە ، بۆیە گوتی : سمیونیچ ، لەوانەیە ئەم مەسەلەیەت بیستبێ ، یان ڕەنگە پێشتر منت دیبێ ؟ »

ـ « چۆن نایبیسم • دونیا پڕ بووە • بەڵام ئیشەکە لە مێژەو لە بیرم کردووە نازانم چۆنم بیستووە • »

ئەکسیۆنۆف پرسی : «ڕەنگە بیستبێت کێ بازرگانەکەی کوشتووە!!»

ماکار سمیونیچ پێکەنی‌و وەڵامی دایەوە : « لەوانەیە ئەو کەسە کوشتبی کە چەقۆیان لەناو جانتای دۆزی‌یەوە • خۆ ئەگەر یەکێکی‌تر چەقۆکەی لەوێ دانا بێ ئەوا وەکو پەندەکە دەڵێ ـ دز تا نەگیرێ بە دز داناندرێ ـ تۆ جانتاکەت بەسەر سەرەوە بوو ، کێ دەتوانێ چەقۆی لەناو دابنێ ؟ بەئاگا دەهاتی ! » •

ئەکسیۆنۆف کە ئەم قسانەی بیست لێی مسۆگەربوو ئەم کابرایە ئەوەیە کە بازرگانەکەی کوشتووە • هەستا ڕۆیشت •

ئەکسیۆنۆف ئەو شەوە خەوی نەچووە چاوان ! زۆر پەست‌و غەمگین بوو ، مێشکی پڕ خەیاڵات بوو • وێنەی ژنەکەی هاتەوە مێشك ئەو حەلەی ماڵاوایی لێ‌کردو ویستی بچێتە پێشانگا ؛ دەتگوت وا لەبەر

چاوی ڕاوەستاوە • ڕوخساری ، دەمو چاوی ، تەنانەت گوێی لە قسەو پێکەنینی بوو • ئینجا منداڵەکانی هاتەوە بەرچاو ، هەموو بچووك بچووك بوون ، یەکێ بەڕۆیەکی لێ پێچرابوو ، یەکێ لە باوەشی دایکی بوو • ئینجا خۆی هاتەوە یاد ، دەوری گەنجیو گاڵتەوگەپو ڕابواردن • ئەوەی هاتەوە یاد چۆن لە بالکۆنی دانیشتبوو گیتاری لێدەدا کە هاتن گرتیان چۆن ئەشکەنجەیان دا ، لە مێشکی خۆیدا ئەو شوێنەی هاتەوە بەرچاو کە لێی قامچی کێش کرا ، ئەو زەلامەی دارکاری کرد ، خەڵکەکەی دەورو بەری ، کۆتو زنجیرەکان ، تاوانبارەکان ، ژیانی هەر بیستو شەش ساڵی ناو بەندیخانە ، تەمەنی بەفیڕۆ چووی ••• هەمووی هاتەوە بەرچاو • لەگەڵ ئەو هەموو بیرەوەری یە وا بێئومێد بوو خەریك بوو لە داخان خۆی بکوژێ • ئەکسیۆنۆف لە دڵی خۆیدا گوتی : « ئەمەش هەمووی لەبن سەری ئەو خوێڕی یەیە ! » ئەوەندە لە ماکار سمیۆنیچ تووڕە بوو ، بەوی با ئەگەر سەری خۆیشی دابنێ تۆڵەی لێبکاتەوە • ئەم شەوە تا بەیانی ئۆقرەی نەبوو بەڵام هەر نوێژی دەکرد • کە ڕۆژ بووەوە لە ماکار سمیۆنیچ نزیك نەکەوتەوە بگرە هەر تەماشایشی نەکرد •

دوو حەفتە بەم جۆرە تێپەڕی • ئەکسیۆنۆف شەو خەوی نەبوو • ئەوەندە کلۆڵو چارەڕەش بوو نەیدەزانی چ بکات ؟

شەوێکیان لەناو بەندیخانە دەسووڕایەوە بینی خۆڵ لەبن قەلوندەیەکی نووستنی گیراوان دەهاتە دەرێ • ڕاوەستا بزانێ چی یە • لەناکاو ماکار سمیۆنیچ لە ژێر قەلوندەکە هاتە دەرێو بە ڕووگرژی سەیری ئەکسیۆنۆفی کرد • ئەکسیۆنۆف ویستی بڕواو تەماشای نەکا بەڵام ماکار دەستی گرتو پێی گوت : کونێکم لەم بن دیوارە لێداوە ، هەموو جارێ خۆڵەکە لە پێڵاوەکانم دەکەمو کە بە ڕۆژ دەمانبەنە ئیش لە ڕێگا خۆڵەکە

دەڕێژم ، جا پیرەمێرد ، وەرە دەنگ مەکە تۆش دەرباز دەبی ، خـــۆ ئەگەر نهێنیم ئاشکرا بکەی ئەوا تا دەمرم دارکاریم دەکەن بەڵام پێشتر دەبێ من تۆ بکوژم ! » •

ئەکسیونۆف کە تەماشای دوژمنەکەی کرد لە ڕقان لەرزی گـــرت ، دەستی ڕاپسکاندو گوتی : « من نامەوێ ڕابکەم ، تۆش چ پێویست ناکا بمکوژی چونکە لەمێژە مـنت کوشـتوە ! لەبـارەی ئاشـکرا کردنـی نهێنی‌یەکەشت ـ ڕەنگە بیکەمو ڕەنگە نەیکەم ـ ئەوە هـەر خـوا خۆی دەیزانێ ! » •

ڕۆژی پاشی کە گیراوەکانیان بردە دەرەوە بۆ ئیش سەربازێـــك هەستی کرد یەکێ لە گیراوەکان خۆڵی لە بەتاڵ کردووە •

بەندیخانەیان پشکنیو نۆینەکەیان دۆزی‌یەوە دادپەروەر هەمـــوو گیراوەکانی خستە بەر پرسـیارو وەلام بەلـکو بـزانێ کێ نۆینەکەی لێداوە • هەموو نکوولی‌یان لێ‌کرد • ئەوانەی دەیانزانی نەیاندەویسـت ئاشکرای بکەن ئەوە ئیشی ماکارە چونکە دەیانزانی ئەگەر ئاشکرا بێ تا دەیکوژن قامچـی‌کێشی دەکـەن • ئەنجـام دادپـەروەر ڕووی کـردە ئەکسیۆنۆف ؛ چونکە دەیزانی کابرایەکی سەرڕاستە ، پێی‌گوت :

« پیرەمێرد ، تۆ پیاوێـکی ڕاستگۆی ، توخودا کـێ ئـەم نۆینەی لێ‌داوە ـ » •

ماکار سمیونیچ ڕاوەستابوو ، وەکو هەر هیـچ نەبووبـێ ، تەماشای دادپەروەری‌دەکـردو لـە بنەوەش سەرنجـی لـە ئەکسیۆنۆف دەدا • ئەکسیۆنۆف دەستو لێوی لەرزین ، ماوەیەك هیچ قسەی پێ‌نەکرا ، بیری کردەوە : « ئەمە بوو ماڵی منی کاوڵ کرد ، بۆچی نهێنی دابپۆشم ! بـا

تۆڵەی ئازارو ئەشکەنجەی منی لێ بێتەوە • بەڵام ئەگەر بیڵێم لەوانەیە لە ژێر داردا بیکوژن • دوور نی‌یە منیش بە هەلە لێی کەوتبمە گومان • بێجگە لەمەش ئەگەر ئەم نهێنی‌یە ئاشکرا بکەم چیم پێ دەبڕێ ؟! »

دادپەروەر لێی دووبارە کردەوە : « دەی ، پیرەمێرد ، بە ڕاستی پێم بڵێ کێ ئەم بن دیوارەی هەڵدڕیوە ؟ »

ئەکسێونۆف تەماشایەکی سمێونیچی کردو گوتی : « جەناب نایڵێم ، خوا حەز ناکا بیڵێم ! ئەوا لەبەر دەستی تۆ دام چیم لێدەکەی لێم‌بکە!»•

هەر چەندە دادپەروەر خۆی هێناو برد ئەکسێونۆف هیچی نەگوت ، ئیدی وازیان لە مەسەلەکە هێنا •

بۆ شەو کە ئەکسێونۆف لەناو نوێن پاڵی دابووەوەو خەریك بوو خەوی لێبکەوێ یەکێ بە هێواشی هاتو لەسەر جێی دانیشت • کە تەماشای کرد ناسی ماکارە •

ئەکسێونۆف گوتی : « چیترت لە من دەوێ ؟ بۆ هاتووی ؟ » •

ماکار سمێۆنیچ بێ دەنگ بوو • ئەکسێونۆف هەستایەوەو گوتی : « چیت دەوێ ؟ بڕۆ بەولاوە ، نەوەك هەر ئێستا نۆبەتدارەکانت بەسەر وەردەکەم » •

ماکار سمێۆنیچ خۆی دەسەر ئەکسێونۆف داهێناو بە چرپەوە گوتی : « ئیڤان دیمیتریچ ، بمبوورە ! »

ئەکسێونۆف پرسی : « لە چیت ببوورم ؟ » •

ـ « من بووم کاتی خۆی بازرگانەکەم کوشت، چەقۆکەم خستە ناو جانتای تۆ • بە تەما بووم تۆش بکوژم بەڵام لە دەرەوە دەنگەدەنگێکم هاتە

بەر گوێ یەکسەر چەقۆکەم خستە ناو جانتای تۆو لە پەنجەرەوە بۆی دەرچووم ! »

ئەکسێونۆف بێدەنگ بوو ، نەیزانی بڵێ چی . ماکار سمێۆنیچ چۆکی داداوە سەر زەوی‌و گوتی : « ئیڤان دیمیتریچ ، بمبوورە ، بۆ خاتری خوا بمبوورە ، دانی پێدا دەنێم کە من بازرگانەکەم کوشتووە ، بەردەبی دەچیتەوە ناو ماڵ‌و منداڵی خۆت .

ئەکسێونۆف گوتی : « بە قسە ئاسانە ، بەڵام ئەوە بیست‌و شەش ساڵە من لەسەر تاوانی تۆ ئازارو جەزرەبە دەدرێم . تازە بچمەوە کوێ ؟ ژنم مردووە ، منداڵم لە بیریان کردووم ، چ جێم نی‌یە بچمێ ... » .

ماکار سمێونیچ هەڵنەستایەوە . سەری لە زەوی داو هاواری کرد : « ئیڤان دیمیتریچ ، بمبوورە ، کە قامچێ‌کێشیان دەکردم ئازارەکەی زۆر لەو ئازارە سووکتر بوو کە تەماشای تۆ دەکەم ... بەزەییت پێمدا بێتەوە ، بۆ خاتری مەسیح بمبوورە ، زۆر کڵۆڵ‌و چارەڕەشم ... » کەوتە فینگە فینگ .

کە ئەکسێونۆف دیتی فینگە فینگ دەکا ئەویش گریاو گوتی : « خوا لێت خۆش دەبێ ، بۆی هەیە من سەد هێندەی تۆ خراپ بم . » لەگەڵ ئەم قسانەدا دڵی ڕوناك بووەوەو ئارەزووی ماڵەوەی نەما . هیچ ئارەزووی ئەوەی نەما کە لە بەندیخانە دەربچێ . چاوەڕێی مەرگی خۆی بوو .

سەرباری قسەکانی ئەکسێونۆف ، ماکار سمێۆنیچ چوو دانی بە تاوانەکانی‌دا نا . بەڵام ئەکسێونۆف تا فەرمانی بەرەلاکرانی بۆ دەرچوو، گیانی بە خاك سپارد .

# بولبولو گوڵەباخ (١)

**نووسینی : ئۆسکار وایلد**
**وەرگێڕانی : کەریم قادر دەشتەکی**

قوتابی‌یە گەنجەکە هاواری کرد : « نازدار دەڵێ ، گوڵێکی سوورم بۆ بێنی سەمات لەگەڵ دەکەم بەڵام سەراپای باخچەکەم گوڵێکی سووری تێدا نی‌یە ! » .

بولبولێك لەسەر داربەڕوویەکی سەوز ، لەناو هێلانەی خۆی گوێی لە قسەکان بوو ، لەناو پەلکەچروەکانەوە تەماشای کردو سەری سوڕما .

قوتابی‌یەکە ، کە چاوە جوانەکانی پڕ فرمێسك بوون ، هاواری کرد : « سەراپای باخچەکەم گوڵێکی سووری تێدا نی‌یە ، ئاخ ، بەختەوەری بە شتی چەند بچووکەوە بەندە . هەرچی زاناو ژیرەکەیشتوو نووسیویانە من خوێندوومەتەوە ، شارەزای هەموو کەلێن و قوژبنێکی فەلسەفەم ، کەچی لەبەر ئەوەی گوڵێکی سوورم دەست ناکەوێ ژیانم لێ تێك‌چووە ! » .

---

(١)
The Works of Oscar Wild : Forme and London. 1977 P.P. 566-9.

بولبولەکە گوتی : « ئەدی ئەمەیە دڵداری ڕاستەقینە ! ئەگەرچی تا ئێستا نەمناسیوە بەڵام شەو دوای شەو گۆرانیم بۆ چڕیوە ، شەو دوای شەو چیرۆکی ئەوم بۆ ئەستێران گێڕاوەتەوە ، کەچی وا تازە دەیبینم • پرچی وەکو داسی ڕەشگوڵ وایە و لێوی وەکو گوڵی ئاواتی سوورە • بەڵام لەبەر خەمو ئازار دەمو چاوی وەك زەعفەران زەرد هەڵگەڕاوەو خەفەت مۆری خۆی بەسەر برۆیەوە ناوە » •

قوتابی‌یە گەنجەکە منگاندی : « سبەی شەو ، شازادە ئاهەنگێکی سەماو هەڵپەڕکێ ساز دەدا • دڵخوازەکەشم دەچێ • ئەگەر گوڵێکی سوورم دەست بکەوێ بۆی بیەم تا بەیانی سەمام لەگەڵ دەکا • ئەگەر گوڵێکی سووری بۆ بیەم دەتوانم من بیگرمە باوەش‌و ئەویش دەست باوێتە سەر شانم‌و توند توند یەکدی بگرین • بەڵام ئاخ ! باخچەکەم هیچ گوڵی سووری تێدا نی‌یە • جا دەبێ بە تەنێ دابنیشم‌و ئەویش دێ‌و بە تەنیشتمدا دەڕواو هەر ئاوڕیشم لێ ناداتەوە • دڵم لەتوپەت دەکا » •

بولبولەکە گوتی : « بەڕاستی ئەمەیە دڵداری ڕاستەقینە • ئەوەی من بە گۆرانی دەیڵێم ئەو لەباری دەناڵێنێ • ئەوەی من خۆشی لێوەردەگرم ئەو ئازاری پێوە دەکێشێ • بەڕاستی دڵداری شتێکی سەیرە • زۆر لە زمڕووت بەنرخترە ، زۆر لە (ئۆپەل) دەگمەنترە ، بە گەوهەرو شەوچرا نایەتە کڕین ، لە بازاڕ چنگ ناکەوێ • بازرگان پێیان ناکڕێ لەگەڵ زێڕیش ناخرێتە بەر تەرازوو » •

قوتابی‌یە گەنجەکە گوتی : « سازندەکان لە شوێنی خۆیان دادەنیشن‌و ئامێرەکانیان لێدەدەن‌و خۆشەویستەکەم لەگەڵ ئاوازی گیتارو کەمان سەما دەکاو هەر ئەوەتەی پێی بە زەوی دەکەوێ •

ماقووله‌کانیش به به‌رگی فش‌وفۆڵ ده‌وری ده‌ده‌ن • به‌ڵام سه‌ما له‌گه‌ڵ من ناکا ، ئاخر هیچ گوڵی سوورم نی‌یه بیده‌مێ !! » وای گوت‌و خۆی به‌ناو گیا داداو ده‌ستی به ده‌م‌و چاوی‌یه‌وه گرت‌و له پرمه‌ی گریانی‌دا •

مارمیلۆقێکی بچووکی سه‌وزی کلك‌قیت به لاوه تیه‌ڕی‌و پرسی : « ئه‌رێ بۆ ده‌گری » •

په‌پووله‌یه‌ك که به دوای تیشکی ڕۆژه‌وه عه‌وداڵ بوو ، گوتی : « به‌ڕاست ! ئه‌وه بۆ ؟ » •

گوڵبه‌هارێك به ده‌نگێکی نه‌رم‌و ناسك چرپاندی : « به‌ڕاست ، ئه‌وه بـۆ ؟ » •

بولبوکه گوتی : « ئه‌وه بۆ گوڵێکی سوور ده‌گری !»

هه‌موو هاواریان کرد : « بۆ گوڵێکی سوور ؟ ئای چه‌ند گه‌مژه‌یه!!»
مارمیلۆقه قه‌شمه‌رجاڕه‌که به‌بێ‌باکی له تریقه‌ی پێکه‌نینی‌دا •

به‌ڵام بولبوکه له نهێنی خه‌می خه‌فه‌تی قوتابی‌یه‌که گه‌یشت‌و به‌بێ ده‌نگـی له‌ســـه‌ر داربه‌ڕووه‌که هه‌ڵکوڕماو بیری له مه‌ته‌ڵی خۆشه‌ویستی کرده‌وه •

کت‌وپڕ باڵه قاوه‌یی‌یه‌کانی لێك‌کرده‌وه‌و فڕی که‌وته ئاسمانه‌وه • وه‌کو خه‌یاڵ به‌ناو بێســتان‌دا تیـه‌ڕی‌و وه‌کو خـه‌یاڵ به‌ناو باخچـه‌دا ڕۆیشت •

بنه‌گوڵه‌باخێکی جوان له ناوه‌ندی مێرگێك ڕوا بوو • بـولبـوله‌که فڕی چووه لای‌و له‌سه‌ر چڵێکی هه‌ڵنیشت‌و هاواری کرد : «گوڵێکی سوورم بده‌رێ خۆشترین گۆرانیت بۆ ده‌ڵێم ! » •

بنەگوڵەکە سەری باداو وەڵامی دایەوە « گوڵی من سپین • وەکو کەفی دەریا سپین و لە بەفری سەرتۆپکەشاخان سپی‌ترن • بەلام برۆ لای برام وا لە دەوری سەعاتە خۆرە کۆنەکەدا ڕواوە ، لەوانەیە ئەو پێویستیت جێ‌بەجێ بکا » •

بولبولەکە فڕی‌یە لای ئەو بنەگوڵەی لە دەوری سەعاتەخۆرەکە ڕوا بووو هاواری کرد : گوڵێکی سوورم بدەرێ خۆشترین گۆرانیت بۆ دەڵێم •

بنەگوڵەکە سەری باداو وەڵامی دایەوە : « گوڵی من زەردن • وەکو پرچی ئەو حوری‌یە بەحری‌یە زەردن کە لەسەر تەختی کەهرەمان دانیشتبێ • لەو نیرگزانە زەردترن کە پێش ئەوەی باخەوان بە خۆو بە داسەوە بگاتە سەریان ، دەپشکوون و گوڵ دەردەکەن ، بەڵام برۆ لای برام کە لەژێر پەنجەرەی قوتابی‌یەکەدا ڕواوە • بۆی هەیە ئەو پێویستیت جێ‌بەجێ بکا ! » •

بولبولەکە فڕی‌یە لای ئەو بنەگوڵەی لە بن پەنجەرەی قوتابی‌یەکە ڕوابووو هاواری کرد : ! گوڵێکی سوورم بدەرێ خۆشترین گۆرانیت بۆ دەڵێم ! » •

بنەگوڵەکە سەری باداو وەڵامی دایەوە : « وایە گوڵی من سوورن • وەکو پێی کۆتر سوورن و لەو مەرجانانە سوورترن کە لە گێژەنی دەریادا شەپۆل دەخۆنەوە بەڵام سەرمای زستان دەمارەکانی سڕ کردووم و خووس چرۆکانی بڕوکاندووم و زریان چلەکانی تێك‌شکاندووم و ئەم ساڵ هیچ گوڵم نابێ ! » •

بولبولەکە هاواری کرد : « یەك گوڵی سوورم دەوێ ، تەنیا یەك گوڵی سوور ! هیچ ڕێی تێناچێ ؟! » •

بنەگوڵەکە وەڵامی دایەوە : ! با ، ڕێیەك هەیـە بەڵام ئەوەنـدە ترسناکە ناوێرم پێت بڵێم » •

بولبولەکە گوتی : « پێمبڵێ ، ئەمن ترسم لەکن نی‌یە » •

بنەگوڵەکە گوتی : « ئەگەر گوڵی سوورت دەوێ دەبێ لەبەر تریفەی مانگەشەو بە سازو ئاواز دروستی بکەی‌و بە خوێنی دڵی خـۆت ڕەنـگی بکەی ! دەبێ سنگت بە دڕکێکەوە بنێی‌و گۆرانیم بۆ بڵێی • دەبێ بـە درێژایی شەو گۆرانیم بۆ بڵێی‌و دڕکەکە دڵت ببڕێ‌و خوێنت بڕژێتـە ناو دەمارەکانم‌و ببێ بە هی من » •

بولبولەکە گوتی : ! مردن لە پێناوی گوڵێکی سوور زۆر گرانـەو ژیان زۆر خۆشەویستە • خۆشە لەناو دارستانی سەوز هەڵبنیشی‌و تەماشای ڕۆژ بکەی بە سواری گالیسـکەی زێڕو مانگ بە سـواری گالیسـکەی مـرواری • بۆنـی گێـوژەکێـویلکـە خۆشـەو گوڵەمێلاقـەی دۆڵ‌و گوڵەخەزێمەی پشکووتووی قەدگردانیشـ جوانن • لەگەڵ ئەمەشـ‌دا خۆشەویستی لە ژیان گرنگترە • ئێ ئاخـر دڵی باڵنـدەیەك لە چاو دڵی بنیادەمێك چی‌یە ؟ ! » •

ئینجا بولبولەکە باڵە قاوەیی‌یـەکانی لێك کردەوەو فـڕی‌و کەوتـە ئاسمان • وەکو خەیاڵ بەسەر باخچەدا ڕۆیشت‌و وەکـو خەیاڵ بەنـاو بێستاندا تێپەڕی تەماشای کرد ، قوتابی‌یە گەنجەکە لە کوێ بوو هەر لە جێی جاران لەناو گیاو گۆڵەکە پاڵی دابووەوە ، چاوی پڕفرمێسك‌بوو •

بولبەلەکە هاواری کرد : « خەنی بە ، خەنی بە ! گوڵی سوورت بۆ دەبێ • لەبەر تریفەی مانگەشەو بە سازو ئاواز دروستی دەکەم‌و بـە خوێنی دڵی خۆم ڕەنگی دەکەم بەرامبەر بەمەش هەر هێندەم لە تۆ دەوێ

که ببی به دڵدارێکی ڕاستەقینە ؟ چونکە هەرچەندە فەلسەفە زیری‌یە بەڵام دڵداری لەویش ژیرترە • هەرچەند ( خاوەن دەسەڵات ) گەورەیە بەڵام دڵداری لەویش گەورەترە • باڵی وەکو هاڵاوو لەشی وەکو بڵێسە وایە لیوی وەکو هەنگوینەو هەناسەی وەکو بخوورە •

قوتابی‌یەکە لەناو گیاوە تەماشای هەورازی کردو گوێی بۆ شل کرد بەڵام نەیزانی ئەم بولبولە دەڵێ چی چونکە ئەو تەنیا ئەو شتانەی دەزانی کە لەناو کتێبان نووسراون ، کەچی داربەڕووەکە تێی‌گەیشت‌و غەمبار بوو چونکە ئەم بولبولەی زۆر خۆش دەویست کە هێلانەی لەناو لك‌وپۆیەکانی هەڵنا بوو •

داربەڕووەکە چرپاندی : « دوا گۆرانیتم بۆ بڵێ کە تۆ بڕۆی بەتەنێ پەست‌و غەمگین دەبم ! » •

بولبولەکە گۆرانی بۆ داربەڕووەکە گوت‌و دەنگی وەکو بڵقەبڵقی ئاوی ناو گومگومە وابوو • که گۆرانی‌یەکەی تەواو کرد قوتابی‌یەکە هەستایەوەو قەڵەمێکی ڕەش‌و دەفتەرێکی لە گیرفانی چاکەتی دەرهێنا‌و بەناو بیستانەکەدا ڕۆیشت‌و لە دڵی خۆی‌دا دەیگوت : ! نکوولی لێناکرێ کچە ئەدگارێکی جوانی هەیە بەڵام ئاخو هەست‌و سۆزیشی وایە ! بە داخەوە وا نی‌یە ڕاستی وەکو زووربەی هونەرمەندان هەر ئەدگاری هەیەو هیچ دڵسۆزی نی‌یە • خۆی لە پێناوی خەڵك بەخت ناکا • تەنیا بیر لە ئاوازو مۆسیقا دەکاتەوە • هەموو کەس دەزانی هونەرمەند خۆپەرستن • لەگەڵ ئەوەش‌دا دانی پێدادەنێم دەنگی خۆش خۆشە • داخەکەم ئەمانە چاکەیان لێ ڕەچاو ناکرێ‌و قەت کردەوەی باش نانوێنن ! » •

ئیدی چووەوە ژووری خۆی‌و لەسەر دۆشەکە بووشە بچووکەکەی

لێی ڕاکشاو کەوتە دالغەی خۆشەویستەکەی‌و پاش نـەختێ خـەوی لێ کەوت •

کە مانگ لە ئاسمان درەوشایەوە بولبولەکە فڕی‌یە لای بنەگوڵەکەو سنگی لە دڕکێك چەقاند؟• چڕی • مانگی بلووری‌نی ساردیش داهاتەوەو گوێی بۆ شل کرد • بە درێژایی شەو هەر گۆرانی چڕی‌و دڕکەکەش تا دەهـات زیاتر لە سـنگی دەچووە خـواریێ‌و خـوێنی لە دەمارەکـان دەڕۆیشت •

یەکەم جار گۆرانی پەیدا بوونی خۆشەویستی ناو دڵی کوڕو کچی گوت‌و لە ترۆپکی بنەگوڵەکە گوڵەباخێکی قەشەنگ پشـکوت • کـە بولبولەکە گۆرانی لە دوای گۆرانی دەچـڕی گوڵەکـە پـەلك پـەلك دەگەشایەوە • یەکەمجار وەکو تەمی سەر ڕووبار کاڵ بوو ، وەکو دامێنی بەیانی زەرد بوو ، وەکو وێنەی ناو گۆماوی گوڵەباخ وا بوو •

بنەگوڵەکە هاواری کردە بولبولەکە بۆ ئەوەی باشتر سـنگی لـە دڕکەکە بچەقێنێ : « بولبولی بچکۆلە ، باشتر دایگرە ، ئەوەك ڕۆژ دادێ‌و گوڵەکە تەواو نابێ ! » •

بولبولەکە باشتر سنگی لە دڕکەکە توند کردو دەنـگی گـۆرانـی‌ی بەرزتر بووەوە چونکە گۆرانی بە پەیدابوونی سۆزی ناو گیانی کـوڕو کچ هەڵدەگوت• پەمباتی‌یەکی وەکو گوڵەمێخەك بەسەر پەلکەکانی گوڵەکە داهات • وەکو پەمباتی ڕوخساری زاوا وا بوو ئەو کاتە کە بووکێ ماچ دەکا • دڕکەکە هێشتا نەگەیشتبووە ناو دڵی بۆیە ناوجەرگەی گوڵەکەش هەر سپی بوو • دڵی گوڵەکە تەنیا بـە خوێنی دڵی بولبـولی بچکۆلـە ، توندتر دایگرە ، ئەوەك ڕۆژ دادێ‌و گوڵەکە تەواو نابێ » •

بولبولەکە باشتر سنگی لە دڕکەکە چەقاندو دڕکەکە گەیشتە دڵیو قرچەی ئازارێکی سەختی بە لەش داهات • تا دەهات دڵی زیاتر ژانی دەکردو چریکەی بەرزتر دەبووەوە • گورانــی ئــەو خۆشەویستی‌یەی گوت کە بە مردن دەگاتە پۆپەو ئەو خۆشەویستی‌یەی کە لەناو گۆڕیش نامــرێ •

گوڵە ســوورەکە وەکــو ئاسمانــی ڕۆژەڵات ســوور هەڵــگەڕا • پەلکەکانی دەرەوەی سوور بوون‌و دڵیشی وەکو یاقووت سوور بوو ، بەڵام بولبولەکە دەنگی کز بوو ، کەوتە باڵەفڕێو پەردەیەکی تەنــکی کەوتە سەرچاو • گۆرانی‌یەکەی کز بووەوە کزبووەوە تا هەستی کرد شتێك گەرووی دەگرێ لەو کاتەدا دوا ئاوازی تێ‌هەڵکردو چریکاندی کە گوڵەکە گوێی لەو ئاوازە بوو ئەوەندە مەست بــوو لــە مەستی‌یان لەرزی گرت‌و پەلکەکانی بۆ کزەبای ساردی بەیان کردەوە •

زایەلە ، دەنگی بــۆ ئەشــکەوتی ئەرخەوانــی نــاو گردان بردو شوانەکانی لە خەو هوشیار کردەوە ، کەوتــە نــاو قامیشی دەو چۆمان‌و ئەوانیش باسەکەیان بە دەریا گەیاند •

بنەگوڵەکە هاواری کرد : « تەماشا ، تەماشا ، وا گوڵەکە تەواو بوو » • بەڵام بولبولەکە وەڵامی نەدایەوە چونکە قیاتی لەبەر بڕا بوو ، دڕکی لە دڵ چەقی بووو لە ناو گیا کەوتبوو •

نیوەڕۆ قوتابی‌یەکە پەنجەرەی کردەوەو تەماشای دەرەوەی کردو هاواری لێ‌هەستا : « ئۆی ! لەو بەختە چاکە ، ئەوەتانێ گوڵێکی ســوور لەوەتی هەم گوڵی وا سوورم نەدیوە • ئەوەنــدە جوانــە هەڵبەت نــاوێکی لاتینی زۆر درێژی هەیە • » داهاتەوەو گوڵەکەی قرتاند •

شەپقەی لەسەر ناو دەستی دا گوڵەکەو هەرڕای کرد بۆ ماڵــی ماموّستا • کچی ماموّستا لەبەر دەرگا ڕاوەستا بوو • ئارمووشی شــینی لە خولخولە دەئالاندو گوجیلە سەگەکەشی لە تەنیشتی وەرکەوتبوو •

قوتابی‌یەکە هاواری کرد : « گوتت ئەگەر گوڵێکی سوورم بۆ بێنی سەمات لەگەڵ دەکەم • ئەوەتا ئەم گوڵەم بۆ هێنای • لە هەموو گوڵێکی دونیا سوورترە • ئەم شەو لەسەر دڵی خۆتی بدەو کە پێکەوە سەمامان کرد بۆت باس دەکا تۆم چەند خۆش دەوێ ! »

بەڵام کچەکە بەڕووگرژی وەڵامی دایەوە : بە داخەوە ئەم گوڵە لە کراسەکەم نایە • بێجگە لەمەش برازای خەزنەدار هەندێ مرواری ڕاستەقینەی بۆ ناردووم • هەموو کەس دەزانێ مرواری زۆر لە گوڵ بەنرخترە ! »

قوتابی‌یەکە بە تووڕەیی گوتی : « بە شەرەفم تۆ زۆر بێ‌ئەمەکی!» وای گوت‌و گوڵەکەی فڕێ دایە ســەر جادە • گــوڵەکە کەوتــە نــاو قوڕاوو عارەبانەیەك بەسەری کەوت •

کچەکە گوتی : بێ ئەمەك ! من چیم بە تــۆ گوت ؟ دیــارە زۆر زۆر ساویلکەی ها ! بێجگە لەمەش پێم ناڵێی تۆ کێی ؟ قوتابی‌یەکیت‌و بەس • بزانە قەت وەکو برازای خەزنەدار قەیتانی قۆندرەت زیوە ؟!»

لەسەر کورسی‌یەکەی هەستاو چووەوە ژوورێ •

قوتابی‌یەکە ڕۆیشت‌و لەبەر خۆیەوە گوتی : « خۆشەویستی شتێکی زۆر پووچە • نیو هێندەی لۆجیك سوودی نی‌یە ، هیچ شتی پێ‌ناسەلمێ، باسی شتی وا دەکا کە نایەتە دی • خۆشەویستی کاری کردەنی (عملی)

نی‌یه‌و له‌م سه‌رده‌مه‌ش‌دا کاری کرده‌نی هه‌موو شتێکه • ده‌گه‌ڕێمه‌وه سه‌ر فه‌لسه‌فه‌و میتافیزیك ده‌خوێنم !»» •

جا قوتابی‌یه‌که گه‌ڕایه‌وه ژووری خۆی‌و کتێبێکی زلی تۆزلێ‌نیشتووی ده‌رهێناو که‌وته سه‌ر خوێندنه‌وه •

٦

هەندێ خواردنی لە ماڵی خۆیان بۆ بێنی ـ منداڵەکە سێوی‌و هەتیــو بوو • لە ماڵی ( جۆن گارگێری ) زاوای ( واتە مێردی خوشکی ) بوو • جۆن گارگێری ئاسنگەری گوندەکە بوو ـ کوڕەکە کارتیغ‌و خواردنی بۆ هێنا • ماگویچ زنجیری پێی بە کارتیغەکە بڕی •••

ماگویــچ زۆر بە سوپاســەوە یــادی ئــەم ڕووداوەی دەکردەوە بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە کوڕەکە لە تەمەنی کچی خۆی بوو • خەمی بوو دەیگوت ئێستا ئەم کچە لەبەر دەستی دایکی دڕندەی (کە دەکــا ژنی ماگویچ ) مردووە • ژنەش لەو ڕۆژەوە کە مێردی دوور خرابووەوە ( جاگەرزی) پارێزەر خزمەتی خۆی پێدەکرد •

کە مس هاڤیشتام بە جاگەرزی گوت گوایە حەز دەکا منداڵێك بەخێو بکا ، جاگەرز ( ئەستیلا )ی کچی ماگویچی بۆ بردە ( سایتس هاوز ) •

مس هاڤیشتام ، هەر لە ساتەوە کــە بــە نامەیــك دڵیــان شکاندو زەماوەندی بووکێنی‌یان پووچ کردەوە بڕیاری دا هەموو شتێك بە دەقە خۆی ڕابگرێ ، هەموو کاتژمێرەکانی وەستاند ، تیشــکی ڕۆژی لــە ژووریْ قەدەغە کرد • کەوتە ژیانێکی سۆفیانە • بەڵام جلی بووکێنی هەر لەبەر بوو جا کە ئەستێلایان بۆ هێنا ویستی بە جۆرێ پەروەردەی بکا کە تۆڵەی خۆی پێ لە هەموو پیاوان بکاتەوە ئەویش بەوەوە کە گەورە بوو دڵی پیاوێك بشکێنێ • بۆ هێنانەدی ئەم نیازەی داوای لە (پەمبلکۆك)ی کرێگرتەیان کرد کوڕێك بنێرێ یاری کاغەز لەگەڵ ئێستێلا بکا •

( پەمبلکۆك ) هەمیشە ئامووشۆی ماڵی ئاسنگەرەکەی ئەو گوندەی دەمزۆنگاوەکانی دەکردو خۆیشی مامی کوڕە بوو ، بۆیە یەکســەر بیری

بۆ برازاکەی چووو خەبەری بۆ ( مسسز گارگێری ) ناردو ئەویش ئەمەی بە هەلێکی باش زانی بۆ ئەوەی کوڕەکە هەم بکەوێتە ژیانێکی خۆش‌و هەم لەبەر دەستی ئەوانەوە ڕزگار بێ ئیدی ناردی‌یە لای ( مس هاڤیشتام ) .

بەم جۆرە ، پیپ ( کە کورتەی - فلیپ پویپ - ە )ی پالەوانی ( ئاوانە مەزنەکان ) ئەو ڕۆژە قەت لە بیر ناکا کە چوون ( سایتس هاوز ) و ئەستێلا لەوێ زۆر بێ‌رەحمانە گالتەی پێ‌کردو بەسەر خۆی دا شکاندەوە .

( پیپ )یان کردە خزمەتکار ، دەبوایە هەموو ڕۆژێ بۆ ماوەی چەند سەعاتێك مس هاڤیشتام بە کورسی‌یەکی پێچکەدار لە ناو مالێ بسوورێنێ کە تەنیا دوو ژوور بووە بەرامبە بەمەش (٢٥) جونەیهی‌دا (جوگارگێری) بۆ پیپی خەرج بکا .

ماوەیەك لێك دوورکەوتنەوە ، دوای سالێك رۆژێکیان پیپ خۆی گەیاندە ( سایتس هاوز ) . لە سەرەوە وای پیشاندا چووە سوپاسی مس هاڤیشتام بکا کەچی ڕاستی‌یەکەی بۆ سەردانی ئەستێلا چوو بوو کە زۆری خۆش‌دەویست .

مس هاڤیشتام لە مالێ بوو بەلام ئەستێلا بۆ خوێندن چووبووە فەرەنسا پیپ بەمە زۆر نائومێدو دلتەنگ بوو بە ناچاری ملی ڕێی گرت‌و گەڕایەوە . زۆر لە دەست کۆمەلەکەی بە گلەو گازاندە بوو .

کە گەڕایەوە مالێ بینی ( ئۆرلیك )ی یاریدەری ( جۆ ) ، بەو زنجیرەی وەختی خۆی لە دەم زۆنگاوەکان دۆزیبوویانەوە ، ئەوەندەی لە خوشکی داوە شڕی کردووە . خوشکی تا مرد ئازاری ئەم لێدانەی چەشت .

( بێدی )ش کە کچە لادێیی‌یەکی دڵساف بووو وەختی خۆی ئەلف‌و بێی بە پیپ گوتبوو هاتە ماڵی ئاسنگەر •

دوای سێ ساڵ ماگویچ ، کە سامانێکی زۆری لە ـ نیوساوزو ویلز ـ بە مەڕداری پێکەوە نا داوای لە جاگەرز کرد کە پیپی شاگرد ئاسنگەر فێری خوێندەواری‌یەکی باش بکات‌و وای پێ‌بگەیەنێ بتوانێ ببێتە میراتگری ئەم سامانە • وا ڕێ‌کەوتن کە هیچ کەس بە هیچ جۆرێ ناوی مامۆستای پیپ نەدرکێنێ تا خۆی ئاشکرای دەکا •

پیپ لای وا بوو کە مس هاڤیشام دروست‌کەری ( ئاواتە مەزنەکان )ی‌یەتی‌و ئەستیلاش هەر بۆ ئەو دەبێ •

پیپ چووە لەندەن‌و لە ژێر چاوەدێری ( ماسۆپۆکێت ) لە ( هامەرسمێت ) خرایە بەر خوێندن‌و لەم شارەدا لەگەڵ ( هاربەرت )ی کوڕی ( پۆلێت ) پێکەوە لە ژوورێك بوون •

پیپ وەختی خۆی بە منداڵی هاربەرتی دەناسی‌و لە سایتس هاوز لەگەڵ یەك بەشەڕ هاتبوون • هاربەرت بە پارەیەکی کەم لە دایەرەیەك ئیشی دەکرد • ئەم دووە برادەری گیانی بە گیانی بوون •

پیپ پەیوەندیەکی باشیشی لەگەڵ ( دێمیك )ی کاتبی جاگەرز پەیدا کرد کە پاش دەواماں یارمەتی دەدا •

ڕۆژێکیان ، ( جۆ ) هاتە لەندەن‌و نامەیەکی ( مس هاڤیشتام )ی بۆ پیپ هێنا نووسی بووی ئەستیلا هاتۆتەوە سایتس هاوزو حەز دەکا چاوی بە پیپ بکەوێ • پیپ کە ئەمەی بینی هەرچی ڕق‌و کینەی بەرامبەر ئەستێلا هەبوو هەمووی گۆڕاو بوو بە خۆشەویستی‌یەکی خەست بەڵام (جۆ) تێی‌گەیاند کە مس هاڤیشتام خۆشەویستی‌ی لە دڵی ئەستێلادا

خنکاندووه • ماوەیەك پێش ئەو کاتە ئەستێلا لە (ڕیچمۆند) لە ماڵێك دەژیا
بۆ ئەوەی شارەزای باری کۆمەڵایەتی‌یان ببێ •

مس هافیشام داوای لە پیپ کرد • لەبەر ئەوەی پیپ لێبرسراوی سەرو
سامانێکی زۆر بوو بە شەرمەوە خۆی لە خـزمەکانی ماڵی ئاسـنگەرەکە
لادەداو زۆر پەشیمان بوو کە (جۆ)ی پشت گوێ خستبوو ، ئەو کاتەی
کت‌وپڕ هەواڵی مردنی خوشکی بۆ هات‌و ناچار بوو بچێتە سەر جەنازەو
ناشتنی • کە چووەوە لەندەن هەندێ بەوە بەختەوەر بوو کـە بە دزی
لەوەی کۆڵی‌یەوە بە پارەبێ بە هاوبەشی ( هاربەرت ) بـەلام ئەوەی
زۆر لە دڵ گران بوو کە بینی ئەستێلا ( درەمل) هان دەداو پێشی دەخات
پیپ یەکەم‌جار ئەو کاتە ( درەمل‌ی) ناسی کە بەیەکەوە لای (پۆکێت)
دەیانخوێند ـ پۆکێت بە پارەی دەرزگوتنەوە دەژیا • پیپ هەستی دەکرد
کە ئەستێلا دەیەوێ لە زێدە هەموو پیاوان خەم بداتە ئەم و لە خەفەتان
بیکوژێ •

کاتی پیپ تەمەنی گەیشتە بیست‌و سێ ساڵ بایەك هـات هەموو
خەونەکانی پەرت‌و بڵاو کردەوە •

ماگویچ کە لە پێناوی پیپ ژیانی کەوتبووە مەترسی ، لە ئوسترالیـا
هەڵات‌و لە ( تێمپل ) خۆی لە پیپ ئاشکرا کرد • ماگویچ ناوی لە خۆی
نا ( پرۆفیس )و پیپ پێ‌ی دەگوت : مامە • بەڵام ئاگاداری ئەوە نەبوون
کە ( ئۆرلێك ) بە هەڵاتنی ماگویچی زانیوەو دەیەوێ بە گرتنیان بـدا
چونکە ڕقی لە پیپ دەبووەوە • بۆیەش ڕقی لە پیپ دەبووەوە چونکـە
وەختی خۆی کە (بیدی) ژنی ئاسنگەرەکە دەری کـردبوو چـوو بـوو
ببوو بە دەرگەوانی ماڵی مس هافیشام پیـپ لە دەرگەوانی‌یەکـەی بـە
دەرکردنی دا بوو •

پیپ‌و هاربەرت بڕیاریان دا ماگویچ بەنە دەرەوەو ئەگەر پێویستی کرد پیپ لەگەڵی بچێ • پێش هەموو شتێ پیپ چـــووە ستاتیس‌و بینی ئەستیلا پشتی تێ‌کردووەو خەریکە مێـــرد بە ( درەمل ) دەکـــا • کە گەڕایەوە لەندەن ( دێمیك ) ئاگاداری کردەوە نەچێتەوە ژووری خۆی، ڕۆژی پاشتر چووە ماڵی کاتبەکـــەو ئەویش ئاگـــاداری کردەوە کـە چاوەدێری بەسەرەوەیە •

پرۆفیس ـ ماگویچ ـ یان ناردە ماڵی دەزگیرانی هاربەرت کە کەوتبـوە دەم ڕووبار • لەلایەکی تریشەوە پیپ‌و هاربەرت پلانیان دانا چـــۆن لەو پەناگایە ماگویچ ببەن‌و ڕزگاری بکەن •

چەند حەفتەیەك پێ‌چوو • ڕۆژێکیـــان مس هاڤیشتام پیپی بانگ کردو چەکێکی بانقی ٩٠٠ پاوەندی دایە بۆ ئەوەی بتوانێ بەشـــداری هاربەرت بکات • ( چونکە پیپ بڕیاری دابوو دەست لە پارەی ماگویـــچ تەدات ) و داوای بوردنی لە پیپ کرد کە بە توندی لەگەڵی جولاوەتەوەو دڵی شکاندووە • پیپ دەوری منداڵی بـــە بیرهاتەوە کـــە لێرە لـــەگەڵ ئەستێلا ڕایاندەبواردو ئەو ئێشەی بە بیر هاتەوە کە مس هاڤیشتام پێی دەکـــرد •

پیپ گەڕایەوە لەندەن‌و لەگەڵ هاربەرت هەموو شتێکی ڕێکخست بۆ ئەوەی بەو پارەی مس هاڤیشتام پێ‌ی‌دا بوو لقێکی تازە لە ( ئیست ، بکاتەوە • پاشان (دێمیك) بە هاربەرت‌و پیپی ڕاگەیاند دەبێ بە مـــاوەی دوو ڕۆژ ماگویچ لە شـــار دەربکەن هـــەر لەو ڕۆژەشـــی ئۆرلیك بـــە پرۆفیسی ڕاگەیاند بوو گوایە پیپی لە چۆلەوانی‌یەك کوشتووە•هاربەرت کە ئەمەی بیست چووە شوێنی‌یەوە • ماوەیەك لەوێ مانەوە • ڕۆژێکیان هەموو پێکەوە ( پیپ‌و هاربەرت‌و ماگویـــچ‌و برادەرێکی‌تر ) ســـواری

کەشتی بوونو هەڵاتن : شەوێ لە کەلاوەیەکی دەم ڕووبارەکە ڕۆژیان کردەوە • شەو گوێیان لە دەنگی کەشتی یەك بوو کـــە ڕۆژ بووەوە کەشتی‌یەکەیان دی • کەشتی‌یەکە چەند ئەفسەرێكو چەند سیخوڕێکی تێدابوو ماگویچیان دەناسی• ئەفسەرەکان تێیان ڕاخوڕینو کە بەرامبەر یەك بوون هەردوو کەشتی لێکیـان دا • ماگویچ سـیخوڕێکی ناســی ( کەکۆمپایسن بوو ) • لەو ناو ئاوەدا کردیانە شەڕ • کۆمپایسن نەبێ ئەوانەی دی هەموو ڕزگار بـوون • ماگویچیش سەولێکی پێ کـەوتو بریندار • ئەفسەرەکان گرتیان گەیاندیانــە نەخۆشـخانە • پیــپ لەبەر ئەوەی زۆر بە تەنگی‌یەوە بوو لە نەخۆشخانە سەری لێ‌دەدا • ماگویچ لەبەر ئەوەی ڕایکرد بوو دایانە دادگـاو دادگـا حوکمی مـەرگی داو هێشتا حوکمەکە جێ‌بەجێ نەکرا بوو ماگویچ مرد • پیپ پێ‌ی‌نەگوتبـوو کە کچەکەی بۆتە ئافرەتێکی جوانو حەزی لێ‌دەکا •

پیپ زۆر بە مەرگی ماگویچ تێك‌چوو ، ماوەیەك نەخـۆش کەوتو کە چاك بووەوە زانی بە درێژایی نەخۆشی‌یەکەی (جۆ)ی هاوڕێ‌ی لە بیرکراوی بە ژوور سەری‌یەوە بووە • کە (جۆ) دڵنیا بوو پیپ تـەواو چاك بۆتەوەو هات بگەڕێتەوە کاغەزێکی بۆ بەجێ هێشت نووسی بووی هەندێکی پارەی قـەردارەو داوای بووردنی لێ‌دەکا کـە نیەتی بیداتەوە • دوای سێ ڕۆژ پیپ شوێنی کەوتو بڕیاری دا ( بیدی ) بخوازێو لای ئاسنگەرەکە بگیرسێتەوە،بەڵام کە چوو بینی پاش مردنی خوشکی (بیدی) مێردی بە (جۆ) کردووە • ئیدی پیپ خوا حافیزی لەو هاوەڵە دێرینانەی تافی لاوی کردو داوای هاربەرتی قبووڵ کرد ، چوو لە ( ئیست ) بوو بە فەرمانبەر •

یازدە ساڵ پێ‌چوو ، پیپ بوو بە هاوبەشی هاربەرتو سـەردانێکی

ماڵی ئاسنگەری کردو بینی ( بیدی و جۆ ) زۆر لە خۆشـــیدانو بـە بەختیاری ڕادەبوێرن ، چووە کەلاوەی ( سایتس هاوز ) بۆ سـەردانی ئەستێلاو بینی ئەستیلا دوای ئـەو هـەموو کوێرەوەری یەی بە دەسـت (درەمل)ی مێردی یەوە چەشتی ، مێردی مردووەو بە بێوەژنی ماوەتەوە •

ئەستیلا داوای بوردنی لە پیپ کردو قۆڵیان بە قۆڵی یەکتردا کردو کەلاوەکەیان بە جێ هێشت •

# پیاوێك بۆ بەشێكی خۆی دەنووسێ (١)

شیعری : ڕۆبەرت بیگ

وەرگێڕانی : ئەختەر عومەر

ئەو ئەشكەوتەی خۆت تێدا شاردۆتەوە ،

بارانی بەسەردا دەبارێ

وەك ئافرەتێ كە برسی و بێخزمەت بێ

كە دەچەمێتەوە سەر زەوی داچێنراو ،

ئاوت لە هەنیە دەتكێ •

ڕوخسارت دەدەیتە بەر ئەو بارانەی

كە بەسەر دۆڵدا دەیهاژوا •

بمبوورە كە منی مێردت

---

(١)
The Faber of Modern Verse : Edited by : Michael Roberts. 1965. P. 386.

له شەقامەکانی شارێکی دوور

بە دەم ڕواناان پێدەکەنم

بەڵام شەو دەچمەوە

ژوورێکی چۆڵ ، ژوورێکی هەزارانە .

لە ژوورێکی ساردوسڕ .

لەناو تەشتو پەقڵەجی بەتاڵ دەنووم

کەواتە لە هەردووکمان

کاممان خراپترینو

چۆن لێك جودا بووینەوە ؟ !

# ییتس (١)

# ١٨٦٥ - ١٩٣٩

**وەرگێڕانی : شکور مەحموود**

ییتس دیارترین نووسەری بووژانەوەی ئـــەدەبی ئیرلەندی‌یە • ساڵی ١٨٦٥ لە (ساندومانتی) نزیك شاری ( دبلن ) لە دایك بووە • سێ ساڵ لە خوێندنگەی هونەری‌دا خوێندوویەتی ، پاشان وازی لێ‌هێنــاوەو ڕووی کردۆتە ئەدەب • ساڵی ١٨٩٩ بە یارمەتی ڕاســـتەوخۆی ییتس ( شانۆی نەتەوایەتی ئیرلەندی - شانۆی ئابی ) دامەزرا • ساڵی ١٩٢٣ پاداشتی نۆبلی وەرگرت •

ییتس لە سەرەتای نووسینی‌دا ڕێبازی ڕۆمانتیکی گرتەبەرو دەربارەی ( داستانی کیلتەکان )ی نووسی بەڵام پاشان ڕووداوێکی گرنگ کاری لە ژیان‌و نووسینەکانی کرد • ڕووداوەکەش ڕاپەڕینە سەرنەکەوتووەکەی ( ئیستەر )ی ساڵی ١٩١٦ بوو کە لە شاری دبلن ڕووی دا • پاش ئـەم

---

(١)

The Twenticth Century Poets : Edited With NotesT by : Maurice Wollman. 1975. P.P. 145-8.

ڕووداوە نووسینەکانی شێوەیەکی تریان بەخۆوە گرتو لەبارەی ژیانی ڕاستەقینەی خەڵك بوون •

ئەم گۆڕانەی ییتس بە شێوەیەکی گشتی بە هۆی ڕاپەڕینەکەو بەتایبەتیش بەهۆی لەسێدارەدانی پێشڕەوەکانی ڕاپەڕینەکە بوو کە ئەمەیان نەك تەنیا کاری لە ییتس کرد بگرە کاری لە هەموو خەڵکی ئیرلەندە کرد •

[ ئەمەی خوارەوەش نموونەیەکە لە شیعرکانی کە بە بۆنەی جەنگی یەکەمی جیهانی‌یەوە نووسیویە • لەم شیعرەدا (ڕوبەرت گریکۆری)ی فڕۆکەوانی ئیرلەندی ـ کە شیعرەکە بە زمانی ئەوەوە گوتراوە ـ لە ئاسمان تووشی مەرگی خۆی دێ] •

**فڕۆکەوانێکی ئیرلەندی**
**پێشبینی مەرگی خۆی دەکا**

من دەزانم لە ئاسمان ، لە ناو هەوران ،

لە جێ‌یەك تووشی چارەنووسی خۆم دێم •

ڕقم لەوانە نی‌یە کە لەگەڵیان دەجەنگم •

ئەوانەیشم خۆش ناوێ کە پاسیان دەکەم •

نیشتمانم ( کیلتەرتان کرۆسە ) ،

هاونیشتمانی‌یەکانم هەژارەکانی کیلتەرتانن ،

کە مەرگی من نە دەیانفۆتێنێو

نە لە پێشووش دڵشادتر جێ‌یان دێڵێ •

نه یاسا ، نه ئەرك ، نه خەڵكی خرۆشاو

وایان لێ‌کردم بجەنگم •

تاکه پاڵدەرێکی خۆشی •

ئەم هەرایەی لەناو هەوران نایەوه •

هەمووم هێنایەوه بیرم ،

هەمووم کێشا ،

ئەو ساڵانەی دێن و

ئەوانەی ڕابردووشن

بێ‌کەلك دیـارن •

# جــۆن کیتس (١)
## ١٧٩٥ ـ ١٨٢١

**نووسینی : جۆرج ئەندرسن**
**وەرگێڕانی : قاسم محەمەد فەتاح**

جۆن کیتس لە (٢٩)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٧٩٥ لە دایك بووە. هێشتا منداڵ بوو دایكو باوکی کۆچی دوایی‌یان کرد . کە باوکی مـرد نۆ ساڵان بوو . کە دایکی مرد پازدە ساڵان بوو . لە ( ئین‌فیلد ) چووە قوتابخانەو ساڵی ١٨٠٦ لە ( ئیدمۆنتۆن ) نەشتەرگەری کردە پیشە . ئەم دوو شارەش لە نزیك ( لەندەن)ن . لە قوتابخانەدا گەنجێکی بە شـان شەوکەتو ژیرو ووریا بوو . زۆر حەزی لە خوێندن بوو ، خوو و ڕەوشتی زۆر بـەرز بوو بـەڵام کە خاڵوانـی ویستیان لە نەشتەرگەری دایبمەزرێنن ، وازی لە قوتابخانە هێنا .

ساڵی ١٨١٥ خەریکی ئەم کارە بوو بەڵام ئەو ساڵە شتێکی لەمەش گرنگتری کرد کە ( ئێری کوین ) ی سپنسەری دۆزی‌یەوە کە بەرزترین

---

(١)
Goerge. K. Anderson : The Literature of England P.P. 784-5.

داستانی چەرخی ووریابوونەوەیە ئیدی بەمەوە دەرگایەکی تری بۆ کرایەوە •

دوای ئەوە سالێك لە نەخۆشخانەدا ئیشی کرد پاشگەز بوومەوە ڕووی کردە کاری ئەدەبی •

( فیری کوین )ی پیشانی ( چارلس کۆدن کلارك )ی هاوڕێی داو لە ڕێی ئەویشەوە گەیشتە لای ( هنت ) کە تێکۆشەرێکی بێندرێژی ئەدەبی شۆڕشگێڕی‌و ڕۆمانتیکی بوو • بە هۆی ( هنت )یشەوە خۆی گەیاندە ( هازلت ) و ( شیلی ) •

سەرەتا وەکو تاقی کردنەوەی ژیانی شاعیرێتی هەندێ سۆنێتەی لە گۆڤارەکەی ( هنت ) بلاوکردەوە وەکو ( کۆلرج‌و ( ویرزوێرت )و ( لامب ) ڕێبازی زانیاری گرتە بەر •

سالی ١٨١٧ کۆمەلە شیعرێکی لە کتێبێك چاپ کردو پێشکەشی ( هنت )ی کرد • پاشان ، بۆ سالی ١٨١٨ ( ئیندیمۆن )ی بلاو کردەوە • لەو ماوەیەدا ( هنت ) بەینی لەگەل ڕەخنەگرەکانی لەندەن تیکچوو • جا لەبەر ئەوەی کە کیتس هاوڕێیەکی نزیکی هنت بوو ( ئیندمۆند ) کەوتە بەر ڕەخنەیەکی توندو تیژ • هەندێ گۆڤارو پەخشنامە ڕەخنەیان لە بەرهەمەکانی کیتس گرت وەکو گۆڤاری Black Wood's Magazine شایانی باسە وەکو هەندێ لەم ڕەخنانە قسەیان لەسەر نیەو زۆر ڕاستن چونکە شیعرەکانی ئەوسای دوور بوون لە هەست‌و سۆزو هەندێ دێری لارو لەنگیان تێدا بوو دێرە جوانەکانیان شێواند بوو • کیتس یان بەوە تاوانبار کرد کە کاریگەری نەشتەرگەری هێشتا بەری نەداوە •

کیتس زۆر بەم ڕەخنەو پێداچوونەوانە دلتەنگ بوو • ئەوەندەماوەیەك

وازی لە ئەدەب هێنا • لە ئەنجامدا تێ گەیشت کە لە ( ئێندمۆند ) دا تەواو پێکەیشتووە •

خێزانی کیتس لە بارێکی زۆر ناخۆش بوو • برایەکی لە ئەمەریکا بوو • برایەکی‌تری بە نەخۆشی دیق کۆچی کـرد بـوو • گیروگرفتی خێزانەکەی‌و مردنی دایکی‌و دەست‌کورتی بە جارێ سەریان لێ‌شێواندە • هەر ڕۆژە تەگەرەیەکی نوێی دەهاتە پێش • گەشتێکی بۆ باکووری ئینگلتەرە کرد بەڵام هیچ خۆشی لێ‌نەدی • ساڵی ۱۸۱۸ بۆی دەرکەوت نەخۆشی وەرەمیەتی‌و ترازیدیای ژیانی گەیشتە لووتکە • حەزی لـــە ( فانی براون ) دەکرد بەڵام لەبەر ئەوەی وەرەمی بوو هیچ بە هیوای نەبوو •

ماوەیەك لە ماڵی (چارلز براون)ی هاوڕێی بوو • نەخۆشی‌یەکەی پشتی لێ‌سەند • چووە هاوینەهەوارێکی ئیتالیا بەڵام تازە کار لە کار ترازا بوو • شەش مانگی نەبرد لە (۲۳)ی شوباتی ۱۸۲۱ سەری هەمیشەیـی نایەوەو لە ( ڕۆما ) لە گۆڕستانی ( پرۆتستانت ) نێژراو پێش مردنـی ئەم ووشانەی بۆ سەر کێلی قەبری خۆی نووسی بوو :

« یەکێ لێرە ڕاکشاوە کە ناوی لەسەر ئاو نووسراوە » •

ساڵی ۱۸۱٦ و پێنج ساڵی پاشتر تا مرد یەکێ بوو لەوانەی ڕووی ئەدەبی ئینگلیزی‌یان گۆڕی • ئەمەش بەو بەرهەمەی کە خۆی ناوی ناوە ( Versifying pet Lamp ) • ئەوەبوو قۆناغێکی‌تری بڕی‌و مەرتەبەیەك گەورەتر بـوو • بـگرە هەقـی خـۆی بوو پێی‌بگوترێ ( گەورەترین شاعیر ) •

کیتس وەسیەتێکی بە پیت‌و هەمەڕەنگی بەجێ هێشت کە یەکێـکە

له نیشانەکانی نەمریی شاعیر ؟ دەڵێ :

وا دەساڵە خەم دەخۆم •

ژیانم لە ناو شیعردایەو

دڵی خۆمی بۆ دەڕەنجێنم •

**نووسینو شیعر ـ ١٨١٦**

کیتس وەکو ( ویردز ویـرث ) سۆنێتـە نووسێکی چەرخـی ڕۆمانتیکی‌یە • شیعرە هەر مەزنەکانی کە ( سروود )ن پایەیەکی بەرزیان لـە ئـەدەبی ئینـگلیزی هەیـە • شـیعرە ووردەکانیشی وەکـو ( La Belle Dame Sans Marie ) کە باسی ڕاو دەکاو شارەزایـەکی باسـی لە فـۆرمو بابـەتدا نوانـدووە ، نیشانەی بەرهەمە پێگەیشتووەکانێتی •

سەرەڕای ئەمە ، کیتس لە نامەکانی‌یەوە دیارە کە دەستێکی باڵای لە ئەدەبی تیزو ساتیر هەبووەو ڕەخنەگرێکی باشی چەرخی ڕۆمانتیـکی بووە • ئەم نامانە جوانترین پارچەی ژیانی شاعیریان تێدایەو لایەنـــی کردەنـی‌و بیروبـاوەڕی نـاو شیعرەکانـی ڕوون دەکەنـەوەو شریتێکی نووسراونو خەباتی ڕێگای هاوسەنگی مرۆڤایەتی‌و یەکێتی هەموو جۆرە فەلسەفەیەکیان تێدایە کە کیتس زۆر جار لە شیعرەکانی شیوەی درامای داونەتێ •

ئەگەر بمانەوێ لە ئەشکەنجەو ئازاری کیتـن بگەین دەتوانین زۆر بە ڕوونو ئاشکرایی لە سروودەکانی وەکو سرووەدی • ( To Autumn ) و ( The Fall of Hyperion ) دا بەدی بکەین •

کیتس ئـەگەر ماوەیـەکیدی بژیبایـە بەرهەمـە ئەدەبی‌یەکانی دەگـەیشتنە پۆپـە بەڵام لـە ئاخروئـۆخری تەمەنـی لەبـەر ئـەوەی نەخۆشی‌یەکەی زۆر گران بوو وازی لە ئەدەب هێنا •

کیتس شتێکی وای بۆ ئەدەبی ڕۆمانتیکی ئینگلیزی داهێنا هیــچ یەکێ لە شاعیرە بەرزەکانی ئەدەبی ئینگلیزی نەیتوانیوە خۆی لێبدەن • باشترین بەرهەمی ئەمانەن کە پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە (٢٦) ساڵــی نووسیوینی !

**گۆرانی‌یەکی خەیاڵی (١)**

فرمێسك مەڕێـژە ! !

فرمێسك مەڕێـژە ! !

گوڵەکە ساڵێکی‌تر دەم دەکاتەوە •

چیتر مەگری ! !

چیتر مەگری ! !

خونچە تازەکان لەناو ڕەگدا دەنوون

چاوت بسڕەوە ، چاوت بسڕەوە !

لە بەهەشت فێر بوویم

سنگم بە گۆرانی چڕین بگەسێنمەوە فرمێسك مەڕێـژە ! !

---

(١) English Yerse : London University Press. Vol. IV. P. 461,

سەر هەڵبڕە ، تەماشا ، سەر هەڵبڕە !

دەفڕم ، خوا حافیز

لە شینایی ئاسماندا بزر دەبم

خوا حافیز ، خوا حافیز !

لەناو گوڵی سوورو سپی

تەماشا ، باڵەفڕە دەکەم .

لەسەر لقی ئەم دارهەنارە ناسکەدا

بمبینە . ئەم دندووکە زیوینەم

دەردی مێرخاسان دەرمان دەکا .

فرمێسک مەڕێـژە ! !

فرمێسک مەڕێـژە ! !

گوڵەکەڵێکی تر دەم دەکاتەوە .

خوا حافیز ، خوا حافیز !

# چەند بیروڕایەك لەبــارەی ئەدەبی نوێ (١)

**نووسینی : لو هسۆن (٢)**
**وەرگێڕانی : شۆڕش ئاكــۆ**

**« ووتارێكە لە (٢٢)ی مایسی ١٩٢٩ بۆ ( كۆمەڵەی ئەدەبــی چینی )ی ســەر بــە زانــكۆی ( یانچین ) خوێندراوەتەوە » .**

ساڵێ زیاترەكەم بۆ گەنجان دواوم چونكە لەوەتی شۆڕش كراوە ماوەی دەمەتەقێ زۆر كەم بووە . یان ئاژاوەچیت یان كۆنەپەرستی ! ئەمانەش هیچیان سوودی كەسیان تێدا نیيە . ئەمجارەیان كە هاتمەوە پەكین چەند كۆنە برادەرێك داوایان لێ كردم بێمە ئێرە قسەتان بــۆ بكەمو لەبەر ئەوەی نەمتوانــی قســەیان بشــكێنم دەبینن وا هاتووم . سەبارەت بە هەرچی بێ بڕیارم نەداوە چی بڵێم ـ بگرە بڕیارم نەداوە

---

(١) On Literature and Anthology : Edited by : David Craig, Penguin Book, 1977.

(٢) لو هسۆن : نووسەرێكی شۆڕشگێری گەورەی چینە ( ١٨٨١ ـ ١٩٣٦ ) .

له چ بابه‌تێك بدوێم ـ • كه بۆ ئێره ده‌هاتم ، له‌ناو باس بووم ویستم بابه‌تێـك بدۆزمـه‌وه بـه‌ڵام ڕێـگاكه ئه‌وه‌نـد ناخـۆش بوو باسه‌كـه هه‌ڵده‌قۆزی‌یه‌وه‌و یه‌ك پێ به‌رز ده‌بووه‌وه بۆیـه ماوه‌ی بـیر كردنه‌وه‌م نه‌بوو • له‌و كاته‌دا بوو ئه‌وه‌م بۆ هات كه به‌كه‌ڵك نایه پیاو شت لـــه ده‌ره‌وه ڕێك بخا • تۆ كه باست هه‌بێ ده‌بێ ڕێگای باشیشت هه‌بێ • هه‌موو شتێ مل‌كه‌چی ده‌وروبه‌ری خۆیه‌تی • به‌ش به حاڵی ئه‌ده‌بیش هه‌ر وایه ـ ئه‌و ئه‌ده‌به‌ی كه له چین پێی ده‌گوترێ ئه‌ده‌بی نوێ یان ئه‌ده‌بی شۆڕشگێڕ •

هه‌ر چه‌ند نیشتمانپه‌روه‌ریش بین ده‌بـێ دانـی پێدابنێین كـه شارستانیمان له دواوه‌یه • هه‌موو شتێكی نوێمان له ده‌ره‌وه بۆ هاتووه‌و زۆربه‌مان به‌رامبه‌ر به هێزه‌كانی نوێ سه‌رسامین • یه‌كێن هێشتا سه‌ری بۆ ئه‌م باره نه‌وی نه‌كردووه به‌ڵام ، بۆ نموونه ، له نیشتگا جیهانی‌یه‌كانی شه‌نگه‌های‌دا ده‌بینی ناوندی مه‌ڵبه‌نده‌كه بێگانه‌ن‌و ده‌وروو به‌ریان ئه‌ڵقه‌یه‌كی وه‌رگێڕو سیخوڕو پۆلیس‌و نۆكه‌رو شتی وایه كه زمانیان ده‌زانـــن‌و ئاگاداری یاسای مافی بێگانان به‌ڵام ڕه‌مه‌كی خه‌ڵك كه‌وتوونه‌ته ده‌ره‌وه‌ی ئه‌م ئه‌ڵقه‌یـه •

كه ڕه‌مه‌كی خه‌ڵك تێكه‌ڵ بێگانان ده‌بن نازانن چ بكه‌ن‌و چ نه‌كه‌ن• كه بێگانه‌یه‌ك بڵێ : « به‌ڵێ » • ته‌رجومانه‌كه‌ی ده‌ڵـێ : « پێم ده‌ڵـێ زلله‌یه‌كی له بنا گوێ بده‌م • » كه بێگانه‌یـه‌ك ده‌ڵـێ : « نـه‌ء » وای وه‌رده‌گێڕن : « كابرا بـكوژه • » جـا بـۆ ئه‌وه‌ی له‌م گرفته بێ‌مانایـه ڕزگار بی پێویستت به زانیاری زیاتر هه‌یه تا بتوانی ئه‌م ئه‌ڵقه‌یه بشكێنی •

لـه دنیای ئه‌ده‌بیش‌دا هه‌مان شته • ئێمـه زۆر كه‌م ده‌زانین‌و كه‌ره‌سته‌ی فێربوونیشمان كه‌مه لیانـگ شیه چیو ( بابیت )ی خۆی هه‌یه ،

( هسو چیە ـ مۆ ) ( تاگور )ی خۆی هەیە ، هۆشیە ( دویّ )ی خۆی هەیە • ئاه ، ئەدی ، هسو چیە ـ مۆ ( کاترین مانسفلید )ی خۆی هەیە کە لەسەر گۆڕی گریاوە • لە قوتابخانەی داهێنانیش ئەدەبی شۆڕشگێڕی هەیە کە ئێستا ڕەواجی هەیە • هەر چەندە نووسینێکی زۆر لەم بابەتە هەیە بەڵام لێکۆڵینەوەیەکی زۆر نەکراوە • تا ئەمڕۆش هەندێ بابەت هەن مولکی تایبەتی چەند کەسێکن و هەر ئەوان لێی دەکۆڵنەوە •

سەراپای ئەدەب ملکەچی دەوروبەرەو دەوروبەر لە قالبی دەدا ئەگەرچی ئەوانەی دەمارگیری هونەرن دەڵێن ئەدەب دەتوانێ ڕەوتی کاروباری جیهان بگۆڕێ •

ڕاستییەکەی یەکەم جار سیاسەت دێ ئینجا هونەر بە گوێرەی ئەوەوە دەگۆڕێ •

تۆ ئەگەر وا تێبگەی کە هونەر دەورو بەرت دەگۆڕێ دیارە ( ئایدیال ـ میسالی )یانە بیر دەکەیتەوە • کەم وا دەبێ ڕووداوو پێشبینی نووسەران یەك بگرێتەوە هەر بۆیەشە ئەوانەی نووسەری شۆڕشگێڕن پێش شۆڕشی مەزن تاوانبار کرا بوون • نووسەری شۆڕشگێڕ ئەو کاتە سەر هەڵدەدا کە شۆڕش بەری دەبێ و مرۆڤ بە سەربەستی هەناسە دەدا • ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە کە کۆمەڵی کۆن دەکەوێتە سەر لێواری ڕوخان زۆر نووسین دەردەکەون خۆیان بە شۆڕشگێڕ پیشان دەدەن بەڵام شۆڕشگێڕ نین بۆ نموونە بۆی هەیە یەکێ ڕقی لە کۆمەڵی کۆن بێتەوە بەڵام تەنیا ڕقی لە دڵ دایەو هیچی تر ـ دوا ڕۆژی لەبەر چاو نی یە • لەوانەیە داوای چاك کردنی کۆمەڵایەتی بکا بەڵام ئەگەر لێی بپرسی چ جۆرە کۆمەڵێکت دەوێ وەڵامەکەی ( یۆتۆپیا ) یەکە نایەتە دی • یان لەوانەیە لە ژیان وەڕس بێ و حەز لە

گۆڕانێکی گەورە بکا کە هەستی بجوولێنێ دەق وەکو یەکێ کە تا مـرۆ بووبێ خواردنو شەڕابی هەڵقوڕاند بێو بچێ بیبەری تیژ بخوا تـــا ئارەزووی خواردنی بکاتەوە • یان وەکو ئەو هەڵمەتبەرە کۆنینانەی خەڵك پشت گوێی خستوون ئیدی لافیتەی نوێ بەرز دەکەنەوەو پشت بە هێزێکی نوێ دەبەستن تا بارێکی باشتر بۆیان بڕەخسێنن •

لە چین ، جاری وا هەبووە نووسەرەکان پەرۆش بووین بۆ شۆڕش بەلام کە شۆڕش هاتووە بێدەنگ بووین • بۆ نموونە وەکو ئەندامەکانی ( ساوث کلەب ) لە ئاخرو ئۆخری سولالەی چینك • ئەم تاقمە ئەدەبی یە ڕێگایان بۆ شۆڕش خۆش کرد ، خەمی ئازاری ( هانز ) یان لەبەر بوو ، زۆر ڕقیان لە زۆرداری ی ( مانچوس ) بوو بە پەرۆش بوون بگەڕێنەوە ( ڕۆژە خۆشەکانی جاران ) بەلام کە کۆمار دروست بوو هەموو کەوتنە بێدەنگی تەواو • من وای بۆ دەچم کە ئەمانە پاش شۆڕش هیوایان بـە ( گێڕانەوەی خۆشی جاران ) هەبوو - واتە شەپقەی قیتو قایشی پانـی فەرمانبەران • جا لەبەر ئەوەی بارەکە گۆڕاو زانی یان ڕاستی لەکار دڕێتەوە هیچ هەوەسی نووسینیان نەما • نموونەی لەمەش ڕوونتر لە ڕووسیایە • لەگەل سەرهەلدانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر زۆر نووسەری شۆڕشگێڕ لەوپەڕی دڵشادیدا بوونو بەخێرهاتنێکی گەرمی ( ڕەشەبا ) کەیان کردو بـــە پەرۆش بوون خۆیان بە گەرداوەکە تاقی بکەنەوە • بەلام پاشان یەسەنینی شاعیرو سۆبـــۆلی ڕۆماننووس خـۆیـان کوشتو ئێستاش دەڵـێن (ئیهرینبورگ)ی نووسەری ناودار خەریکە بەرەو کۆنەپەرستی دەڕوا • جا ئەمە هۆی چی یە ؟ هۆی ئەوەیە کە ئەو شتەی ڕایاندەماڵێ (ڕەشەبا) نی یەو ئەوەی تاقی یان دەکاتەوە ( گەرداو ) نی یـە بەڵـکو شۆڕشـێکی بەئەمەكو ڕاستەقینەیە • ئەوانە خەونو ئاواتیان ڕەویوەتەوە بۆیە ناتوانن

چیتر بژین • ئەمەش لەو بیروباوەڕە کۆنە چاکتر نی یە کە دەڵێ کاتێ تۆ دەمری گیانت دەچێتە بەهەشتو لە تەنیشت خوا دادەنیشێ کێك دەخوا(١) چونکە پێش بەدی هاتنی ئاواتیان کۆچیان کردووە •

بێ گومان دەڵێن تازە شۆڕش لە چین بەرپا بووە • رەنگە ئەمە لـە بواری سیاسی‌دا وا بێ بەڵام لە بواری ئەدەبـی‌دا نـە• • هەنـدێ کەس دەڵێن : « ئەدەبی پیتی بورژوازی خەریکە سەر دەردێـنێ • » راستـی ئەدەبی وا نی‌یە • ئەم جۆرە ئەدەبە هەر سەری نی‌یە تا دەری‌بێنێ • بە گوێرەی ئەو قسەیەی پێشتر کردم ـ کە کورتەو بە دڵی شۆڕشگێڕانە ـ هیچ گۆڕانو ڕابەڕینێك لە ئەدەب نەبووەو ئـەدەب نە ڕەنـگدانەوەی شۆڕشە نە هی پێشکەوتن •

لە بارەی ئەدەبی هەرە شۆڕشگێڕی ڕادیکالیشەوە کە ( کۆمەڵەی داهێنان )ی ـ ئەدەبی زەحمەتکێشان پشتی دەگـرێ ، قسـەی بۆشە • شیعرەکەی (وانگ تو ـ چینگ) کە**لە** هیچ شوێنێ ڕێگای بلاوکردنەوەی نەدراوە ، لە نیشتگای جیهانی شەنگەهای نووسراوە کاتێ کە خۆی لـە ( کانتۆن )ی شۆڕشگێڕ شاردبووە ، بەڵام بەرهەمەکەی‌تری •••

بۆنگ ، پۆنگ ، پۆنگ

ئەو پەڕەکەی ئەوسەرنجانە پیشان دەدا کە پۆستەری فلیمەکانی شەنگەهای‌ی پروپاگەندەی سۆیاسۆس دەریانبڕیوە • لاسای ( دوازدە )ی بلۆك دەکاتەوە بەڵام بەهرەو هێزی بلۆکی تێدا نی‌یە زۆر کەس (دەست)ی کیۆمۆجۆ بە بەرهەمێکی نایاب دەزانن کە باسی ئەوە دەکا چۆن شۆڕشگێڕێك دوای شـۆڕش دەستێکی دەفەوتێ بـەڵام بـە دەستەکەی‌تـری دەستـی خۆشەویستەکەی دەگرێ ـ بەڕاستی زیانێکی گەورەیە !! ئەگەر بتکەنە

(١) ئیشارەتە بۆ شیعرێکی ( هێن ) •

سەر پشك لە دۆڕاندنی ئەندامێكی لەشت بێ گومان دەستت لە هەموویان لا هەرزانترە • ( پێ ) ناخۆشە ، ( سەر ) لەویش ناخۆشترە • خۆ ئەگەر هەموو زیانێكت یەك دەست بێ ئازایی نی یە پیلەكەی لەسەر بكەی •

من وای تێدەگەم كە شۆڕشگێڕ دەبێ وا پەروەردە بكرێ كە ئامادە بێ قوربانی لەمەش گەورەتر بدات •

( دەست ) چیرۆكێكی كۆن كۆنە باسی خەباتی زانایەكی هەژار دەكات كە وەكو باوە بە كۆشكی تاقی كردنەوەدا دەڕوات و كچێكی جوان دێنێ •

ڕاستی ، ئەمە تیشكێكی باروزروفی ئەمڕۆی چینە • بەرهەمێكی ئەدەبی بەم دوایی یە لە شەنگەهای بلاوبۆتەوە بەرگەكەی وێنەی ڕمێكی سێ نووكی لەسەرە ، كە لە بەرگی ( نیشانەی كلۆلی ) (١) وەرگیراوە ، چەكوتی ئالای سۆڤیەتیش لە نووكی ناوەڕاستی چەقاندراوە • ئەم تێهەلكێش كردنە وا دەگەیەنێ كە تۆ نە بەڕمە سێ نووكەكە دەتوانی تێ بكۆشێت • گەودەنی هونەردەمەكە پێشان دەداو هیچی تر ـ ئەمە نموونەیەكی باشە بۆ هەموو ئەم جۆرە نووسەرانە •

بێ گومان ئەستەمە لە چینێكی كۆمەلایەتی یەوە بچیتە چینێكی تر بەلام باشترین شت ئەوەیە كە بە ئاشكرا بیرو باوەڕی خۆت دەربڕی تا خەلكی بزانێ ئاخۆ دۆستی یان دوژمن • ئەگەر مێشكت پڕی شتی پڕوپووچی كۆنە بەوە مەیشارەوە كە بە شێوەیەكی درامی پەنجە بۆ لووتت درێژ بكەی و بلێی : « تەنیا من زەحمەتكێشی ڕاستەقینەم ! » نووسەرە شۆڕشگێڕەكانیشمان كە ئارەزوویان لێ نی یە تیوروكتێبی دەرەوە

---

(١) كتێبێكی ڕەخنەی ئەدەبی یە ( هاكسۆن كوریا گاوا ) نووسیویە•

وەربگرن بە شێوەیەکی درامی پەنجە بۆ خۆیان درێژ دەکەن و ( سەرکۆنەی بە بڕیاری ئیمپراتۆری )ی دوا سولالەی ( چینگ )مان پێ دەبەخشن کە کەس نازانێ سەبارەت بە چی‌یە •

وا بزانم دەبێ دەستەواژەی ( سەرکۆنەی بە بڕیاری ئیمپراتۆری )تان بۆ ڕوون بکەمەوە • ئەمە هی سەردەمی ئیمپراتۆری‌یە • ئەگەر فەرمانبەرێك هەڵەیەکی بکردایە دەبوایە بچێتە دەرەوە چۆك دابداو ئیمپراتۆر زەلامێکی خەساوی تێبەردەدا دارکاری دەکرد • ئەگەر کابرا بیتوانیبایە لەپـــی خەساوەکە چەور بکا یەکسەر نێی‌دەگەرا ئەگەر نا جوێنی بە سەراپای بنەماڵەکەی دەدا هەر لە باپیرە گەورەوە تا نەوە • گوایە ئەمە هەمووی بـە قسەی ئیمپراتـۆرە ، بـەڵام کـێ هەبوو بتـوانی بچێتـە لای ئیمپراتۆرو لێی‌بپرسێ داخۆ بەڕاستی مەبەستی ئەمە بووە ؟ بە گوێرەی گۆڤارێـکی ژاپۆنی ، پار ، جوتیارو کرێکارانی چین ( چێنگ ڤانگ ـ وو )یـــان هەڵبژارد بۆ ئەوەی بۆ خوێندنی دراما بچێتە ئەلمانیا • بەڵام ئێمـە بـۆمان ساغ نابێتەوە داخۆ بەڕاستی بە هەڵبژاردن بووە یان نە؟

هەر بۆیەشە هەموو جارێ دەڵێم ئەگەر بمانەوێ زیاتر تێبگەیـــن دەبێ زیاتر کتێبی بێگانە بخوێنینەوە، بۆ ئەوەی بتوانین ئەڵقەی دەوروبەرمان بشکێنین ، ئەمەش هێندە گران نی‌یە بۆ ئێمە مانان •

ئەگەرچی کتێبی ئینگلیزی زۆر نی‌یـە لەبـارەی ئـەدەبو زۆری لەبارەوە نەکراوە بە ئینگلیزی بەڵام ئەو کەمەی کە هەمانـە زۆر جـێی بڕوایە • ئەگەر ئەدەبو بەرهەمی تیوری بێگانە زۆر بخوێنینەوە ، کـــە هاتینە سەر هەڵسەنگاندنی ئەدەبی چینی ڕێگات زۆر ڕوناك دەبێ • لەوەش باشتر ئەمەیە بتوانی ئەم بەرهەمانە بێنیتە چـین وەرگێڕان لە هەڵبەستـنی نووسینی خراپ ئاسانتر نی‌یە بەڵام بەشداری‌یەکی گەورەتر دەکات بـۆ پێشخستنی ئەدەبی نوێمان و زۆر سوودبەخشترە بۆ گەلەکەمان •

# ژیانو بەرهەمەکانی
# شەکسپیر (١)

**نووسینی : دەبلیو تێرنەر**
**وەرگێڕانی : حسام کەریم زەمان**

★ **ژیانی شەکسپیر :**

زۆر کەس هەن نکوولی لە ژیانو بەرهەمەکانی شەکسپیر دەکەن بگرە هەر ئینکاری ئەو پیاوە بلیمەتە دەکەنو وای دەردەخەن کە ئـەو پیاوە مەزنە هەر نەبـووەو بەرهەمەکانیشی دەدەنە پـاڵ ناودارانـی وەکو (باکۆن) و (مارلۆ) و هەندێ فەیلەسووفو زانای نەناسـراوی تـر • بەڵام ئەو نووسراوو گەواهی‌نامانەی کە لایەنـە ووردەکانی ژیانـی شەکسپیریان تۆمار کردووە هەر لە زووەوە بیروڕای ئەم جۆرە کەسانەیان زیندەبەچاڵ کردووە •

شەکسپیر ساڵی ١٥٦٤ لە ( ستراتفۆرد ) لە دایك بووە • دوو خوشكو سێ برای هەبووە • سەرەڕای ئەوەی کە ( جۆن شەکسپیر )ی باوکی دوکاندار بوو پارچە زەوی‌یەکیشیان هەبوو گوزەرانیان پێ‌دەکرد • ئەم

---

(١)
Turner's Sheakspeare, As yoy Like IT, P.P. XI XVII.

خێزانەیە هەندێ جار بە ئاسوودەیی ژیاونو گوزەرانیان باش بووە ، هەندێ جاریش ڕۆژگار خۆی لێ وەپشت گێڕاونو دووچاری دەستکورتیو بێوڵەتی هاتوون •

ئێمە شتێکی زۆر کەم لەبارەی ژیانی سەردەمی منداڵێتی ئەم زانایە دەزانین ، تەنیا ئاگاداری ئەوەین کە لە ستراتفۆرد لە قوتابخانەی ڕێزمان ـ ( Grammar - School ) خوێندوویەتی بەڵام لە تەمەنی سێزدە ساڵی وازی لێ هێنا چونکە باوکی لەسەر قەرزاری فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوو • ئەم پەمەنەو دایکیشی ناچار بوو چتی کەلوپەلی هەبوو هەمووی بفرۆشێتەوە • هەر لەو کاتەوە ، شەکسپیر بۆ دابین کردنی ژیانی خۆیو ماڵەوەیان دەستی بە ئیش کردو ئیتر نەگەڕایەوە قوتابخانە • لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە شەکسپیر شتێکی وا لە قوتابخانە فێر نەبووە هەر لەبەر ئەوەشە کە ( بێن جۆنسۆن ) تانووتی لێدەداو بەوە تاوانباری دەکا کە زمانی لاتینی کەمزانیوەو هیچ زانیاری لەبارەی یۆنانی ( گریکی )یەوە نەبووە

شەکسپیر لە نۆزدە ساڵی ژنی هێناو ( ئان هاتا وای ) بوو بە هاوسەری ژیانی • سێ منداڵیان بوو : سۆزانا ، هامنێت ، ژودێت • ژنەکەی هەشت ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو و پڕوپاگەندەی واش بڵاوبووبووەوە گوایە بەینیان زۆر خۆش نەبووە بەڵام هیچ بە دەستەوە نییە ئەوەمان بە تەواوی بۆ ساغ بکاتەوە ئەوە نەبێ کە شەکسپیر لە پارچەیەکی شانۆگەری (دوازدەهەمشەو)دا ئامۆژگاری ئافرەتان دەکاتو دەڵێ پێویستە مێرد بەو پیاوانە نەکەن کە بە تەمەن لە خۆیان منداڵترن •

شەکسپیر لە تەمەنی ٢٠ ـ ٢١ ساڵیدا چووە لەندەنو لەوێ جێگیر بوو • لەو کاتەدا کەوتە شوێن هەندێ کاری بێسەمەرە بەڵام زوو وازی

لێهێناو وەرچەرخایەوە سـەر باری ئاسایی جارانی • هەر چەنـدە زانیاری‌یەکی کەممان لەبارەی سەرەتای ژیانی شەکسپیر لەلەندەن هەیە بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە دوای ئەوەی چووە ئەوێ ئەکتەری کـردە پیشەو ساڵی ١٥٩٣ یەکـەم بەرهـەمی بە ناوی ( ڤینۆس‌و ئەدۆنیـس ) بڵاوکردەوە • ساڵی ١٥٩٤ لە ( Lord Chamber Lain's Company ) بوو بە ئەندام •

ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە کۆنەوە لەبارەی ژیانی شەکسپیر دەرچووین وا دەگەیەنن کە شەکسپیر مرۆیەکی چاوتێرو دڵنەرم بووە ، زۆر سادەو تێکەڵی بووە ، ڕەفتاری لەگەڵ هەموو کەس باش بووە •

شەکسپیر ئەو کـاتەی کـە مـزوولی هـونەری نوانـدن بـووە زۆر کاری‌تریشی کردووە وەك داهێنان‌و بەکارهێنانی شێوازی نوێ‌کردنەوە ( Re - Modelling ) و داتاشین‌و ڕەخسـاندنی ئەو شێـوازانە بە بە جۆرێ کە لەگەڵ شانوگەری‌یە کۆن‌و دێرینەکاندا بگونجێن ، ئەمەش وای لە شەکسپیر کرد کە بیر لە دوا ڕۆژ بکاتەوەو لەبارەی پێداویستی بەرهەمە شانۆگەری‌یەکان‌و کاریگەری تەکنیکە درامی‌یـەکان ووردبین بێ • ساڵی ١٥٨٧ پەیوەندی لەگەڵ ( کۆمـەڵەی شانۆگـەری ) پەیـدا کردو ئەم پەیوەندی‌یە تا سـاڵی ١٦١١ی خایاند • لەو بەینەدا حـەفت شانۆگەری‌و هەموو ( چامەنادرامی‌یەکان ـ Nondramatical Poetry ) نوسی •••

ئەو دەستەو کۆمەڵەی شەکسپیر پەیوەندی لەگەڵ هەبوون هەموو ئەندامەکانی کاراو بەسوود بوون بۆیە کۆمەڵـەکەیان زۆر گەشـەدارو سەرکەوتوو بوو • شەکسپیر هەر خۆیشی سەرپشـك بوو لەناویـان ، بۆیە ئەو کاتە گوزەرانی نەختێ باش بـووو توانی بەشـداری لەگـەڵ

( شانۆی جیهانی ـ ( Globe - Theatre بكا كه هێشتا هەر لـه
لەندەن مابوو ، زەوی‌ی ( شوێنی نوێ ـ ( New Place شی لـه
( ستراتفۆر ) كڕی • بەرهەمە شانۆگەری‌یەكانیشی لە سـاڵی (١٥٩٧)
ەوە پێهەڵ هاتنە چاپ كردن •

زۆر بەڵگەمان بەدەستەوەیە كە شەكسپیر لە كاتی حوكـمڕانی
ئەلیزابێتی كەڵە ئەدیبو شاعیرو نووسـەرێكی وا بووە لە بەرهـەمو
نووسینی ئەدەبی‌و دیوانو كتێبی شانۆگەری‌یەوە بەرایی بۆ كەس چۆل
نەكردووە • ( گرین ) لەو بارەیەوە زۆری لەبابەت دواوەو گەلێـكی
پیدا هەڵگوتوەو•سەرباری ئەمانەش شەكسپیر ئەكتەرێكی سەركەوتووو
لێهاتوو بووە ، زۆر شانۆگەری كۆنی زیندوو كـردۆتەوەو لـە قالبی
نوێدا دایڕشـتوونەتـەوە • ( فرانـسیز مێریز ) باسـی قسەخۆشـی و
زمان‌شیرینی شەكسپیر دەكاتو دەڵێ ئەو مرۆڤە لە بابەتی ( تراجیدی ـ
( Tragedy ) و ( كۆمیدی ـ ( Comedy هەردووكیان ئەسپی
خـۆی تاوداوەو لـە هـەردوو بـابـەتدا سـەركـەوتووەو لـە
هـەردووكیـان ڕێكـاری بـەرزی پێشـان داوە • لـە بەرهـەمـە
درامی‌یەكانی شەكسپیرەوە دیارە كە ئەو چەرخەی ئەو لێی ژیاوە زۆر
ناخۆش‌و پڕ ئەشكەنجە بووە • دڵتەنگـی‌و نوشوسـتو نامۆیی هەمـوو
ناوچەكانی تەنی بووەوە •

ساڵی ١٦١١ بە خۆو بە خاوو خێزانەوە گەڕایەوە سـتراتفۆردو
هەر لەوێ مایەوە تا دواجار ، ساڵی ١٦١٦ لە (٢٣)ی نیسـان كە ڕۆژی
لە دایك‌بوونی‌یەتی •الأوایی لە جیـهانی ئـەدەبو ئەدەب‌دۆسـتانو لـە
شانۆو شارە جوانەكەی خۆی كرد •

ئەو ماوەی كە شەكسپیر لە لەندەن بوو ، خێزانەكەیشی هەر لەگەڵ

بوو بەڵام هەندێ کەس بەربەرچی ئەم ڕایە دەدەنەوە •

هیچ گومانی تێدا نی‌یە کە شەکسپیر دوای گەڕانەوەی بۆ ستراتفۆرد تا ڕادەیەك بە، خۆشی ژیاوەو بێ وەی بووە ، باری ئابووریشی نەختێ باش بووە ، خەڵکی شارەکە زۆر ڕێزیان گرتووە • بەم جۆرە ناوو دەنگ‌و ڕووەتێکی باشی پەیدا کردووە •

شەکسپیر ، وەکو شاعیرێك ، بیروباوەڕی خۆی بەرامبەر بە شاعیران دەردەبڕێ‌و دەڵێ : شاعیر تەنیا ئەوە نی‌یە کە بەهرەیەکی خۆڕسکی هەبێ وەکو زۆر کەس وای تێ‌گەیشتوون بەڵکو دەبێ ئەو بەهرەیە لە ژیانی ئاسایی ، لە هەڵس‌و کەوت‌و کرداری ڕۆژانە بەکار بێنێ •

★ **بەرهەمەکانی شەکسپیر :**

شەکسپیر لە ساڵی ١٥٨٨ تا ١٦١٢ زۆر بە چوست‌و چالاکی قۆڵی لە نووسین هەڵکرد • هەموو جۆرە جوانکاری‌و شێوەو دارشتنێکی هونەری بەکار هێنا بۆ مسۆگەر کردنی داهێنانی ئەدەبی‌و چاك‌کردن‌و بەهێزکردنی باری ئەوسای ئەدەبی • زۆر جار دەتوانین بە هۆی - شێوە ( ستایل ) و کێش‌و زمان - ی شانۆگەری‌یەکانی‌یەوە لە گیانی ئەو چەرخە بگەین کە ڕووداوەکانی شانۆگەری‌یەکانی لێ‌قەوماوە بەڵام باوەڕپێ‌کراوترین نموونەی ئەو جۆرە بابەتانە ئەوانەن کە بە (کێش) نووسراونەتەوە •

ئەگەر سەرنجێ لە بەرهەمە شانۆگەری‌یەکانی بدەین دەبینین بەرهەمەکانی بەرایی بە زۆری قافیەدارن یاخود ئەو جۆرە ڕستانەی بەکار هێناوە کە پێی‌دەڵێ ( Endstop ) و هەر یەکەیان لە بارەی

ماناو بیرو دارِشتنی ڕێزمانی‌یەوە سەربەخۆیەو لەوانی‌تر جودایە • ئەم نموونەیەی خوارەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە :

لەو جیهانە فراوانەدا لەگەڵما بەتەنیا دەڕوا

لێم گەڕێ با بە تەنیا پێی‌هەڵبڵێم ، لێم گەڕێ •

با پێکەوە دوڕو مەرجانو خۆش‌گوزەرانیمان وەدەست بێنین •

بەڵام ئەگەر هاتوو ڕستەکان هەر یەکە سەربەخۆ نەبوو ، یان دارِشتنی ڕێزمانی‌یان تەواو نەبوو ، بەم جۆرە دەگوترێ ( Run - On Lines ) هەر وەك لەم نموونەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

ئایا نەریتێکی کۆنینە بوو کە ژیانی خۆی خۆش کرد

لەوە زیاتر کە خۆی بکاتەوە لەیستۆکێکی ڕەنگاوڕەنگ یا ئەو دارستانانە •

لە چاوتەنگی‌و بەخیلی ئەو کۆشك‌و دادگایانە بێ‌ترس نەبوون ؟

لەم نموونەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم جۆرە دارِشتنە، ڕستەکانی بێ‌خاڵبەندی کۆتایی‌یان دێ • شەکسپیر بە زۆری ( Run - On - Lines )ی لە بەرهەمەکانی بەکار هێناوە • هەندێ جاریش قافیەی بەکار هێناوە ، ئەمەش یەکێکە لەو سوخەتانەی کە دەتوانین بەرهەمە شانۆگەری‌یە کۆنەکانی پێ لە نوێکان جودا بکەینەوە • لە شانۆگەری ( هەروەك ئارەزووی دەکەی ) زۆر بە کەمی قافیەی بەکار هێناوە کەچی لە شانۆگەری ( هاملێت ) و ( ئۆتیلۆ ) دایەلۆگەکان بە زۆری قافیەدارنو ڕستەکان لە جۆری ( Endstop )

ن • ئەو بابەتـە شانۆگـەرییانەی کـە لـە زووەوە بەرهـەم هـاتوون ڕەنگدانەوەی نەریتو ڕوخساری ئەو کاتەیان زۆر پێوە دیارە •
هەروەها بەکار هێنانی شتی خەیاڵیو ووشەی کۆنو قەبەی پڕ مانا ، یـا ڕێبازی بەراوردکردنی شت بە شێوەیەکی سەرسوڕێنەر ، لـەو کاتـەدا شتێکی ئاسایی بوو • بەڵام وا دیارە کـە ئـەم دیاردانـە پەیتا پەیتـا لـە بەرهەمە نوێکانی کەم دەبنەوە تا وایان لێدێ نامێنن •

ڕاسـتی ، شەکسـپیر زۆر هەنگـاوی بـەرزی لەبارەی هونـەری شانۆگەرییەوە هاویشـتووە • لە یەکـــەم هەنگـاویدا ئەو چیرۆکـە شانۆگەرییانەی نوێ کردۆتەوە کە لە کۆنەوە ڕوویان دابوو ، بێگومان ڕووداوی چیرۆکەکان لە خەڵکی ناوچـەکە نابەڵەد نـەبوون • لەبـەر ئەوەی لەو سەردەمەدا هیچ ڕێسـایەکی نووسـینو ڕوونووس کـردن نەبوو ، تەماشا دەکەی شانۆگەرییەکانی پراکتیکی بوونو بە موڵـــکی خەڵك دادەندران •

دەتوانین بەرهەمە شانۆگەرییەکانی شەکسپیر بەسەر چوار ( تاف ـ Period ) ـ واتەقۆناغ ـ دابەش بکەین :

یەکەم تاف : دەتوانین بڵێین تا ساڵی ١٥٩٥ دەوامی کـردو گەلێ چیرۆکی کۆمیدی لێ هاتە بەرهەم وەکو ( دڵدارێکی ڕەنج بەخەسار ) ، (کۆمیدی هەڵەکان) بێگومان بەهۆی بەرهەمەکانی ئەم تافەوە گەورەییو لێهاتووی شەکسپیرمان بە چـــاکی بۆ دەرناکەوێ • جـا بـا سـەیری ڕۆژانیدی بکەین بزانن چ گەنجینەیەکیان تێدایەو چ تۆیشەبەرەیەکیان پێیە بۆ ڕێبوارانی ڕێگای ژیان •

لە تافی دووەمدا ( ١٥٩٥ ـ ١٦٠١ ) شەکسپیر ئەم شانۆگەرییانەی

نووسی : ( هەروەك ئارەزووی دەكەی ) كە بە بەرزترین شانۆگەری كۆمێدی دادەندرێو ( دوازدەهەم شەو ) ٠

بەڵام تافی سێیەم تا ساڵی ١٦٠٨ دەخایەنێ ٠ لە بەرهەمەكانی ئەم تافەوە دیارە كە گۆڕانێكی بنەڕەتی لە گیانو دونیای شانۆگەری‌یەكان ڕووی داوە ، چونكە ڤەدزفڕیتە سەر بەرهەمی تراجیدیو ئەوانیش ئەم شانۆگەری‌یانەن كە پەیوەندی‌یان بە شتی بەنرخو گرانبەهای ژیان هەیە یان تابۆی مردنو گلكۆو ترسو مشەختی دەگرنە خۆیان ٠ ( هاملێت )و ( ئۆتیلۆ و ( ماكبێت ) و (لیرپاشا) شانۆگەری تراجیدین ٠

زۆر نووسەرو توێژەوەر هەوڵیان داوە هۆی ئەو گۆڕانە بزانن ، یەك لەوانە پرۆفیسۆر ( داودن ) بووە ٠ ئەم پرۆفیسۆرە لەو باوەڕە دایە كە ئەو گۆڕانەی لە مێشكو دڵو دەروونی شەكسپیردا ڕووی داوە بۆتە هۆیەكی سەرەكی بۆ گۆڕانی شێوەو ناوەرۆكی بەرهەمەكانی ٠ هەروەها دەڵێ بەرهەمە تراجیدی‌یەكان نۆبەرەی ئەو تەمو مژو بێزاریو تاریكی‌یەن كە لە مێشكی شەكسپیردا خولیان دەخواردەوە بەڵام ئێمە زۆر لەگەڵ بیروباوەڕەكانی ( داودن )دا نین چونكە دەتوانین بە شێوەیەكی زۆر ئاسایی هۆی ئەو گۆڕانە ڕوون بكەینەوەو بە شتێكی سروشتی بدەینە قەڵەم ٠

دوا تاف كە بە دەوری شانۆگەری ڕۆمانتیكی ناسراوە تا ساڵی ١٦١٢ دەخایەنێو ئەم بەرهەمانەی لێ وەدەست هاتوون : ( چیرۆكی گەرداوەكە )و (١) ( سیمبلاین )و ( هەقایەتی زستان ) ٠ ئەم سێ

---

(١) جەمال نەبەز ئەم شانۆگەری‌یەی كردۆتە كوردیو ساڵی ١٩٥٥ لە چاپخانەی مەعارف ـ بەغدا چاپی كردووە ٠

شانۆگەری‌یە، کە بە درامای ڕۆمانتیکی ناوبراون ئەگەر لەگەڵ هەر شانۆگەری‌یەکی‌تری تراجیدی بەراوردیان بکەین دەبینن زۆر قووڵن‌و پڕ نوشوست نیگەرانین هەر بە هۆی ئەوانیشەوە هەڵویستی شەکسپیرمان بەرانبەر بە ژیان بۆ دەردەکەوێ ؛ بۆمان دەردەکەوێ کە شەکسپیر گیانی لێبووردن‌و بەخشینی زالتر بووە بەسەر گیانی ڕق‌و کینەو سزاو جەزرەبەدان • ئەگەرچی چیرۆکە درامی‌یەکانی زۆر ئاسایی نین‌و بە هیچ ڕێسایەکەوە پەیوەست نین بەلاّم لەگەڵ ئەمەش‌دا هونەری ئارایش‌و جوانی‌یان لە ڕێکارێکی بەرزدا لێ‌بەدی دەکەین •

دەتوانین ئەوشانۆگەریانەی لە هەر چوار تافەکەدا هاتوونەتە بەرهەم بە گوێرەی کاتی دەرکەوتنیان بەم جۆرەی خوارەوە ڕێك بخەین :

**تـافی یەکەم :**

| | |
|---|---|
| — کۆمیدیای هەڵەکان — | The Comedy of Errors |
| — دڵدارێکی ڕەنج‌بەخەسار — | Loves's Labour Lost |
| — دوو پیاو ماقووڵی ڤیرۆنا — | Tow Gentlemen of Verona |
| — خەونی شەوێکی هاوین — | Midsummer Night's Dream |
| — ڕۆمیۆو جۆلیت — | Romeo and Juliet |
| — تیتۆس ئەندرۆنیکۆس — | Titus Andronicus |
| — هنری شەشەم — | Henry VI |
| — ڕیچاردی سێیەم — | Richard III |
| — ڕیچاردی دووەم — | Richard II |

**تـافی دووەم :**

| | |
|---|---|
| Merchant of Venice | ـــ بازرگانی ڤینیسیا ـــ |
| Th½e Taming of Shrew | ـــ کەوی کردنی کیوی‌یەك ـــ |
| Much and About Nothing | ـــ چەنەلێدانی بەلاش ـــ |
| As you Like It | ـــ وەك ئارەزووی دەکەی ـــ |
| The Merry Wives of Windsor | ـ دەزگیرانە بەکەیفەکانی وندسۆر |
| Twelfth Night | ـــ دوازدەهەم شەو ـ |
| King John | ـــ جۆن پـاشا ـــ |
| Henry IV | ـــ هنری چوارەم ـــ |
| Henry V | ـــ هنری پێنجەم ـ ـ |

**تـافی سێیەم :**

| | |
|---|---|
| All's Well That Ends Well | ـ شتی چاك ئەوەیە ئاخری خێر بێ |
| Troilus and Cressida | ـــ ترۆیلوس‌و کرێسیدا ـــ |
| Measure for Measure | ـــ فیتاوفیت ـــ |
| Julius Caesar | ـــ یۆلیۆس قەیسەر ـــ |
| Hamlet | ـــ هاملێت ـــ |
| Ofhello | ـــ ئۆتیـلۆ ـــ |
| King Lear | ـــ لیر پاشا ـــ |

| | |
|---|---|
| ــ ماکبێث ــ | Macbeth |
| ــ ئەنتۆنیو کلیۆپاترە ــ | Antoy and Cleopatra |
| ــ کۆریۆ لانۆس ــ | Coriolanus |
| ــ تیمۆنی ئەسینا ــ | Timon of Athens |

**تـاقی چوارم :**

| | |
|---|---|
| ــ سیمبلاین ــ | Cymbeline |
| ــ حەقایەتی زستان ــ | The Winter's Tale |
| ــ چیرۆکی گەرداوەکە ــ | The Tempest |
| ــ پرکلیس ، ئەمیری سوور ــ | Pericles. Prince of Tyre |
| ــ هنری هەشتەم • | Henry VIII |

هێشتا شەکسپیر لە ژیاندا بوو کە ئـەو بەرهەمە شانـۆگەری‌یانەی چاپ کران بەڵام زۆر بەرێك‌و پێکی نەنووسرابوونەوەو مەرجی هونەری‌یان لێ نەهاتبووە دی • ئەو بەرهەمانە لـە چاپکراوەکانـی Quarto بوون‌و لە ساڵی ( ١٥٩٧ )ەوە دەستیان بە دەرکەوتن کرد • لەمەوبـەر باسی ئەوەمان کـرد کـە هیـچ یاسایـەکی نووسـین‌و ڕوونووس‌کردنی دەستووس‌و بەرهەمی ئەدەبی لە ئارادا نەبوو • واش زەن دەکرێ ئـەو بەرهەمانەی لە زووەوە چاپ کراون شەکسپیر ئاگای لێ نەبووبن‌و هەندێ کەسی ناسراو بڵاویان کردبنەوە ، بەڵام هەندێکیان بە دەستخەتی خۆی بـۆ چاپ ئامادە کراون •

لە پاشی مەرگی شەکسپیر ( هێمنگز )و ( کۆندێل ) هەموو بەرهەمەکانیان کۆکردەوەو بە ناوی ( یەکەم کتێب ) •چاپیان کرد • بێ گومان ئەم ئەرکەی کە ئەو دوو کەسە بەجێیان هێنا یەکەم هەنگاوە لە بارەی بایەخدانی ڕێك‌وپێك بە بەرهەمەکانی شەکسپیر دەبێ ئەوەیشمان لەبیر بێ کە هەینێ دەزگای چاپ کردن هێشتا زۆر گەشەی نەکرد بوو و چاپەمەنی‌یەکان پڕ هەڵەو چەوت‌و چەوێل بوون بەڵام لەگەڵ ئەوەش‌دا جەوهەری کارو بەرهەمەکانی شەکسپیریان بۆ ئێمە پاراستووە چونکە بە هۆی ئەوانەوە بوو توانیمان کە ئێمە شەکسپیر بناسین‌و شەکسپیریش خۆی بە ئێمە بناسێنێ •

# ڕێبازەکانی ڕەخنەی ئەدەبی (۱)
## گرفتی ئەفلاتوونی

نووسینی : دیڤید [illegible] (۲)
وەرگێڕانی : عەزیز گەردی

ڕەخنەی ئەدەبی بایەخ بە گەلێ مەسەلە دەدا : بۆی هەیە پرسیاری فەلسەفی لەبارەی سروشتی ئەدەبی خەیاڵی‌یەوە بکات • نە ڕوانگەی لۆجیکیشەوە دەبێ ئەم پرسیارە پێش هەموو پرسیارەکانی‌دی بێ - چونکە ئەگەر پێشەکی نەزانین باسی چ شتێ دەکەین چۆن دەتوانین گفتوگۆی دەربارە بکەین ؟ لەگەڵ ئەمەش‌دا تۆژەوەرەکان پێش ئەوەی سروشتی ئەدەب ڕوون بکەنەوە ( جاری وابووە ) پرسیاری‌تریان دەرهەق ئەدەب کردووەو پرسیارەکانیشیان بە دڵنیایی‌یەوە کردووە چونکە مەرج نی‌یە ڕێگای تێگەیشتن هەمیشە هەر شەقامێکی لۆجیکی ئاشکرا بگرێتەبەر •

---

(۱)
David Daiches : Critical Approaches to Literature. London. 1975. P.P. 3 - 10

(۲) دیڤید دایچیس لە ئینگلتەرە لە دایك بووەو لە زانکۆی ئەدنبرەو ئۆکسفۆرد تا پلەی دکتۆری خوێندووە لە شیکاگۆ مامۆستا بووە • کاتی شەڕی دووەمی جیهانی بۆتە سەرباز • لە زانکۆی (کۆرنیل)و زانکۆی کامبرج مامۆستایەتی کردووە •

## مه‌سه‌له ڕه‌خنه‌یی‌یه گه‌وره‌کان

بۆمان هه‌یه بپرسین ئه‌ده‌ب ئیشی چی‌یه ؟ واته بۆمان هه‌یه له ڕووی ئه‌رك‌و په‌یامه‌وه پێناسه‌ی بکه‌ین‌و نرخی ده‌ست‌نیشان بکه‌ین • ده‌توانین زیاتر پرسیاری نرخ‌سازی ڕه‌پێش بکه‌ین تا پرسیاری وه‌سفی‌و هه‌وڵ بده‌ین بزانین چۆن شتی چاك‌و شتی نه‌ختێ چاك‌و شتی خراپ له به‌رهه‌می ئه‌ده‌بی‌دا له‌یه‌ك جودا بکه‌ینه‌وه • له بواری وه‌سفیش‌دا بۆمان هه‌یه هه‌موو جۆره ته‌کنیکه تایبه‌تی‌یه‌کانی شی‌کردنه‌وه‌و ڕوون‌کردنه‌وه به جۆرێ به‌ره‌و پێش به‌رین که ده‌رخستنی نرخه‌که‌ی تێدا بێ • ڕه‌نگه چاره‌ی ئه‌و گرفته سایکۆژی‌یه‌ش بکه‌ین که ئاخۆ زه‌ین له کاتی داهێنانی ئه‌ده‌بی‌دا چۆن کار ده‌کات • دواجار بۆی هه‌یه ڕه‌خنه‌ی ئه‌ده‌بی هه‌ر هیچ پرسیارێك نه‌کات چونکه زۆ ڕێگای‌تر هه‌ن ، ده‌توانێ به یه‌کێ له‌و ڕێگایانه توانای هه‌ڵسه‌نگه‌ندنی ئه‌ده‌بی لای خوێنه‌ر پێش بخات‌و په‌ره‌ی پێ‌بدا • ئه‌م ڕێگایانه‌ش هه‌ر له ڕوون‌کردنه‌وه‌ی ( بابه‌تی ـ موضوعی )ی تایبه‌تی‌یه‌وه بگره تا ده‌گاته ڕوون‌کردنه‌وه‌ی ئه‌وه ئاخۆ به‌رهه‌مه‌که چۆن به شێوه‌یه‌کی خۆیی ـ ذاتی ـ بگره به هۆی ژینامه‌ش ) کاری له ڕه‌خنه‌گر کردووه • جا بۆی هه‌یه ئه‌رکی ڕه‌خنه‌گر ئه‌رکێکی ئه‌نتۆلۆژی ، یا ده‌ورگێڕان ، یا نرخ‌شناسی ، یا وه‌سفی ، یا سایکۆلۆژی ، یا هه‌ڵسه‌نگاندن بێ • هه‌ر یه‌که له‌م چالاکی‌یانه‌ش شوێنی خۆی‌و سوودی خۆی هه‌یه • ئه‌و پرسیارانه‌ش که دێنه پێشه‌وه به زۆر جۆری جیاواز کراون‌و ده‌کرێن •

لێکۆڵینه‌وه‌ی سروشتی ئه‌ده‌ب به شێوه‌یه‌کی فه‌لسه‌فی که له‌م پرسیارانه‌دا خۆی ده‌نوێنی : « نیشانه تایبه‌تی‌یه‌کانی ئه‌ده‌ب چین ؟ ئه‌ده‌ب چ جیاوازی له‌گه‌ڵ جۆره‌کانی‌تری ئاخاوتن هه‌یه ؟ » دوو هه‌زار ساڵ زیاتره به‌رده‌وامه بگره ئه‌مڕۆش ئه‌وه‌نده گه‌رم‌و گوڕه نه‌بێته‌وه !!

پرسیارەکە پرسیارێکی وایە هەر نەوەیەکی نوێ دێ حەز دەکا بە شێوەی تایبەتی خۆی وەڵامی بداتەوە ، چونکە ئەدەب دیاردەیەکی ئاڵۆزەو لە هەر سەردەمێکدا ڕوویەکی دەردەکەوێو جەختی لەسەر دەکرێ • هەر چەندە وەڵامەکان لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکیتر دەگۆڕێن بەڵام هەر کۆمەڵە وەڵامێك لەو وەڵامانە خێزانێکی هاوچەشن پێکدێنن‌و دەشتوانین زۆر بە ئاسانی ، بە شێوەیەکی گشتی ، بڕیان بکەین • بێجگە لەمەش هەر چەندە هەندێ وەڵام پەیوەندی پتەویان بە کرۆکی تایبەی ئەدەب‌و بە سەردەمی تایبەتی‌یەوە هەیە بەڵام دیسان وەکو تۆوی تایبەتی وان‌و ڕەخنەگرەکانی دواتر قبووڵیان دەکەن ، یان دووبارە لێکیان دەدەنەوە ، یان دەیانکەنە بناغەو بینای لەسەر دەکەن ، یان بەهەر شێوەیەکیتر سوودیان لێ‌وەردەگرن • بۆی هەیە ( پۆیتیکا )ی ئەرەستۆ بەسوودترین وتوێژ بێ کە بۆ لێکۆڵینەوەی سروشت‌و نرخی ئەدەبی خەیاڵی تەرخان کراوە • ـ پۆیتیکا لە سەدەی چوارەمی پێش لە دایك بوونی مەسیح نووسراوە ـ • هەروەکو دەزانین ئەم کتێبە ناتەواوو نیوەچڵە بەڵام سەرباری ئەمەش هێشتا هەر بناغەیە بۆ هەموو گفتوگۆیەکی ئەم مەسەلەیە • ئەرەستۆ کە مانای ئەدەب لێك دەداتەوە دێ جۆرەکانی لێك جودا دەکاتەوەو ئەرکی چی‌یە پێشانی دەداو لە ڕوانگەی ئەو ئەرکەوە دەینرخێنێ‌و لەو کەسانەی پاس دەکا کە ئەدەب بە شتی بێ‌نرخ‌و بێ‌ڕەوشت دادەنێن •

ئەدەب ، بەو مانایەی کە ئێمە لێرەدا بەکارمان هێناوە ، هەر جۆرە نووسینێك دەگرێتەوە : چ شیعرو چ پەخشان ، کە مەبەستی تەنیا ڕاگەیاندنی ڕاستی نەبێ‌و بەس بەڵکو مەبەستی گێڕانەوەی چیرۆکیش بێ ، ( جا چ داهێنانێکی تەواو بێ ، چ بە هۆی داهێنانەوە زیانێکی

تازەی پێ ببەخشێ ) لە هەمان کاتیش‌دا بە هۆی خەیاڵی داهێنانی نـــاو ووشەکان خۆشیش ببەخشێ •

بێ گومان ئەمە پێناسەی ئەدەب نی‌یە ؛ چونکە ئەگەر هەر لە ئێستاوە پێناسەی ئەدەب بکەین‌و مانای لێك‌بدەینەوە دەبێ باسەکانی ناو ئەم کتێبە(١) بەتاڵ بکەین ؟ بۆیە ئەمەیان تەنیا ئیشارەت‌کردنێکە بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی زاراوەکـــە •

سەیرە کە هیچ ووشەیەکی ئینگلیزی نی‌یە دەقاودەق بەرامبەر بـە ( Poesis ) ی گریـکی‌و ( Dichtung ) ی ئەڵەمانی بوەستێ • ئەم دوو زاراوەیە بۆ بەرهەمی خەیاڵی‌ی ئەدەبی بەکاردێن‌و وەکـو زاراوەی ( Literature ) هەموو نووسراوێك ناگرنەوە •

زاراوەی ( Poetry ) بەو شێوەی کە نووسەرەکانی پێشـــوو بەکاریان هێناوە ، ( بۆ نموونە ، بەو جۆرەی کە سیر فیلیب سیدنی لـە کـــتێبی ( Apologie for Poetrie ) بەکاری هێناوە ) مانـــای لـە ( Poesis ) ( Dichtung ) فراوانترە • چونکە چۆن مانای زاراوەی LITERATURE فراوان بووە ئاواش ئەمانە مانایان تەسك بۆتەوە • هەر بـۆیە ناکـرێ ناونیشانـی بەرهەمە زلەکـەی ( گۆتـێ ) کـە نـاوی ( Dichtung und Wahrheit ) ە بـە چاکـی‌و پـڕ بە پیستی خـۆی بکەینە ئینگلیزی • ئەم ناونیشانە مانای (شیعرو ڕاستی Poetry and Truth نی‌یە بەڵکو زیاتر بە ( نووسینی خەیاڵی و ڕاستی ) لێك‌دەدرێتەوە یـــان ئەگەر هەر ناچار بین بە سێ ووشە بیکەینە ئینگلیزی دەڵێن مانای (چیرۆك‌و ڕاسـتی - ( Function and Truth ) دەگەیەنێ •

(١) مەبەستی کتێبەکەیە ( ڕێبازەکانی ڕەخنەی ئەدەبی ) کە ئەم ووتارە پارچەیەکە لە بەشی یەکەمی کە ( گرفتی ئەفلاتوونی )یە •

## شیعرو ڕەوشتخوازەکان •

بەکارهێنانی زمان بۆ مەبەستی‌تری غەیری ڕاکەیاندنی ڕاستەقینەی ڕووت هەر لەو کاتەوە کەوتە زێــــر ڕکێفی گومانــەوە کــە بیروڕای ڕەوشتخوازی ڕێك کەوت‌و سیستەمی فەلسەفی پەرەی سەند •

لە قۆناغی بەرایی شارستانی‌دا جیاوازی نێوان ڕاستەقینەی شیعری‌و ڕاستەقینەی ڕووت زۆر ئاشکرا نەبوو لەبەر ئەوەی کە هەموو گفتوگۆیەکی زمان رەمزی سەرەڕۆ بوون هەموو خەبەرێك خوازەیی بوو ، خــەیالیش هەمیشە هەر لەبەر دەست بوو بۆ وەسف کردن‌و ڕوون‌کردنەوەی زیانــی ڕاستەقینە • شیلش هەر ئەمەی مەبەستە کە لە ( بەرگری‌یەکی شیعر ـ ( A Defence of Poetry ) دا دەلێ : « لە سەردەمــی منداڵێتی دنیادا هەموو گفتوگۆیــەك ، بە مانایەکــەوە ، شــیعری بووە • بینادەمی سەرەتایی ) بیانەوێ‌و نەیانەوێ زمانیان خوازەیی‌یە ، واتــــە نیشانەی سەردەمی پەیوەندی دەرك نەکراوە نێوان شتەکانەو هۆشیان بە جۆرێ پێش‌دەکەوێ کە ئەو ووشانەی دەریاندەبڕن وایان لێ‌دێ دەبنــە ڕەمزی کۆمەڵە بیرێك نەك وێنەی بیری چڕ • ئەو حاڵەش ئەگەر هیــچ شاعیری نوێ پەیدا نەبێ پەیوەندی‌یە شیرازەپچڕاوەکان سەر لە نوێ زیندوو بکاتەوە ، زمان بەرامبەر بــە دەربڕیــنی مەبەســتە پیرۆزەکانی گفتوگۆی مرۆڤایەتی وەکو مردووی لێ‌دێ » •

ئــەم جۆرە شــیعرە ساکارەی کە شــیلی باسـی دەکا لە ڕووی هوشیاری‌یەوە هیچ جیاوازی لەگەڵ بەکار هێنانەکانی‌تری زمان‌دا نی‌یە • هەر کاتێ کە شیعر نیشانەی جوداو تایبــەتی وەربگرێ دەبێتــە جێی گومان • ئەگەر شیعر ڕاستی دەرنەبڕێ دیارە شتێکی ناڕەوشتانەیەو هەر هیچ نەبێ سوودی نی‌یە •

سەیر نی‌یە کە ئەو بیروباوەڕەی دەڵێ : ڕەنگـە خـەیاڵی شـیعری ڕاستەقینەی قووڵی خۆی لە باری هەرە سەرەتایی شارستانی‌دا دەربڕێ، بیروباوەڕێکی نوێ‌و ترسناك نەبوو بێ بۆ بنیادەم • کە شارستانێتی بەرەو پێشەوە چوو ئەم تێکەیشتنە لە ئارادا نەماو ئیدی دەبوایە ڕەخنەگرەکان بە ئەرکی هوشیارانە سەر لە نوێ زینـدووی بکەنـەوە • بەم جـۆرە سەلماندنی خەیاڵی شیعری ، کە لای بنیادەمی سەرەتایی پێویسـتی بـە سەلماندن نەبوو ، بوو بە ئەرك‌و پەیامی هەرە گرنگی ڕەخنەگرانی ئەدەب لە شارستانێتی پێگەیوەوە •

## شاعیر ئیلهامی لە خواوە بۆ دێ

ڕێگایەکی گەورەی مسۆگەرکردنی ئەم سەلماندنە بریتی بوو لە لێك جودا کردنەوەی تەواوی ئەدەبی خەیاڵی ( ئەوەی سیـدنی بـە شـیعری دادەنـێ )و هەمـوو شـیوەکانی‌تری دەربڕیـن • شـاعیـر ئافەریدەیەکی سەر بە خوانەو بە شێـوەی خـەڵکی‌تر زمان بەکار ناهێنی بەڵکو لە حاڵی جەزب‌و سەرگەرمی ئیلهامی یەزدانی‌یەوە دێتە گۆ •

ئـەم جـۆرە بیرو لێکـدانەوەیە شـاعیری لە یاسـای ئاسـایـی هەڵسەنگاندن‌دا بردە دەرەوەو خستی‌یە نێوان پێغەمبەراتی‌و شێتی کـە هەندێ جار ئەمیانەو هەندێ جار ئەویانەو هەندێ جاریش هەردووکیانە• بێ‌گومان ئەم بیروباوەڕە ڕەگەزێکی زۆر سەرەتایی تێدا بوو لە قۆناغەکانی هەرە زووی شارستانێتی‌دا شتێکی ئاسـایی‌و باو بوو کە پێغەمبـەر بـەر لەوەی بکەوێتە حاڵی سەربەخودانی‌و قسەی خوا ڕابگەیەنێ دەبوایە مەشق بکات‌و خۆی ڕابێنێ‌و بکەوێتە حاڵی جەزب‌و سەرگەرمی• لەگەڵ ئەمەش‌دا پێویست بوو ئەم بیروباوەڕە بە مشت‌ومالێکی شێنەیی • پێش بخرێ بۆ

ئەوەی شاعیر لە سەرکۆنەی فەلسەفی دوور بخاتەوە • ئەفلاتون لـە بەشێکی ( فیدروس ) ەکەی‌دا باسی ئەم بیروباوەڕە دەکات :

[ ••• جۆری سێ‌یەم شێتایەتی ئەو کەسانەیە کە بوونەتە ئامێر و قالبی بەردەستی میوزیس میوزیس دەچێتە ناو گیانێکی ناسك‌و پاکیزەو لەوی کە دەگاتە پلەی جەزب‌و سەرگەرمی ئاوازی گۆرانی‌و هەمـوو ئەوانەی‌تری تێدا هوشیار دەکاتەوە بۆ ئەوەی ، بەو ئاوازانە ، کردەوەی پاڵەوانە دێرینەکان بۆ نەوەی نوێ بڕازێنێتەوە • بـەڵام ئەو کەسـەی هیچ شێتایەتی مۆزیسی تێکەڵ بە گیانی نەبووبێ‌و بێتە بەردەرگاو بیەوێ بە هۆی هونەرەوە بچێتە ناو ئایدەوە ـ دەڵێـم ئەو جۆرە کەسـە نـە خۆی‌و نە شیعرەکەیشی هیچیان ڕێگای چوونە ژوورەوەیان نـادرێ • لە هیچ شوێنێ نەبووە پیاوی ژیر ڕکابەری لەگەڵ پیاوی شێت بکات • ]

ئەفلاتون لە ( ئایون )ەکەی‌دا ئەم بیروباوەڕە ڕوونتر دەکاتەوە • لەوێ ، وای دادەنێ کە شاعیر ستراندێژێکی ئیلهامکراوە ؛ خوا بە هۆی ئەوەوە بە دەنگ دێ • کابرایەکی وایە ویست‌و هونەرەکەی هی خۆی نی‌یە ، تەنیا ئامرازێکی تەپڵاو بێ‌ئەرکەو هیچی‌تر • لەو دەمەتەقێ‌یـەدا سوکرات بە ئایۆن دەڵێ :

[ ئەو بەهرەیەی تۆ هەتە هونەری تێـدا نی‌یە بەڵکو وەکـو تازە گوتم ئیلهامە • هێزێکی یەزدانی هەیە دەیجووڵێنێ وەکـو هێزی ناو ئەو بەردە وایە کە ( یۆرپیدیس ) پێی دەڵێ ( ماکنێت ـ مقناتیز ] و لەناو خەڵکیش بە بەردی ( هیراکلیـا ) ناسراوە • ئەم بەردە وا نەبێ ئەڵقەی ئاسن ڕابکێشێ‌و بەس بەڵکو هێزی ڕاکێشـان بە ئەڵقەکـانیش دەبەخشێ • جاری وا هەیە دەبینی کۆمەڵێك پارچە ئاسن‌و ئەڵقە پێکەوە لکاون‌و زنجیرێکی درێژیان پێك هێناوە : هەموویشیان هێزی ڕاکێشان

لە بەردی یەکەمەوە وەردەگرن • هەر بەم جۆرەش ، میوزیس لە سەرەتاوە خۆی دەکاتە ئیلهامی هەندێ کەس و زنجیرەیەك ئادەمیزادی‌تر ئیلهام لەوانەوە وەردەگرن و پێیاندا شۆڕ دەبنەوە •

هیچ شاعیرێکی چاك ، چ شاعیری مەلحەمی بێ و چ شاعیری لیریکی ، شیعرە جوانەکانی بە هونەر نانووسێ بەڵکو بۆیە دەینووسێ چونکە ئیلهامی پێدراوەو سەربەخۆدانە • چۆن کاتێ کە ڕەبەنە کۆریبانتی‌یەکان سەما دەکەن هوشیان لای خۆیان نی‌یە شاعیری لیریکیش کە سرووده جوانەکانی دادەنێ هۆشی لای خۆی نی‌یە کەچی کە دەکەوێتە بەر هێزی سازو کێشەوە ئیلهامی بۆ دێ دەق وەکو پەری‌یەکانی باخوس ، ئەوانیش وان ، کە دەکەونە بەر کاریگەری دیونیسیس شیرو هەنگوین لە ڕووبارەکان هەڵدێنجن کەچی ئەو کاتەی هۆشیان لە خۆیانە وایان پێناکرێ • گیانی شاعیری‌لیریکیش هەر وایە، وەکو خۆیان باس دەکەن دەڵێن ئێمە گۆرانی لە کانی هەنگوین هەڵدەگۆزین و لە باخچەو لانەکانی میوزیس لە بێژینگی دەدەین و وەکو هەنگ لە گوڵێکەوە بۆ گوڵێکی‌تر بۆیان لە شەقەی باڵ دەدەین• ڕاستە ! چونکە شاعیر شتێکی سووك و باڵدارو پیرۆزەو تا ئیلهامی بۆ نەیەت و لە هەست نەکەوێ و هۆشی نەڕوا شتی پێداناهێنرێ : تا ئەگاتە ئەو بارو دۆخە هیچ هێزی لەبەردا نی‌یەو سرووشەکەی پێ دەرنابڕێ • زۆر ووشەی بەرز هەن شاعیر باسی کردەوەی خەڵکیان پێ دەکا بەڵام بەو شێوەی کە تۆ باسی هۆمیروس دەکەی ئاوا بە پێودانگی یاسای هونەری باسیان ناکا ؟ بەڵکو ئیلهامی بۆ هاتووە ، میوز ئیلهامی پێ‌خشیوەو بەس • جاشاعیرەکان کە ئیلهامیان بۆ هات : یەکێ سرووودی دیترامبی ڕێك دەخاو یەکێ ویردی ستایش و یەکێ

سروودی کۆرس‌و یەکێ شیعری مەلحەمی‌و یا ئەیامبی ـ ئەوەی لـە یەکێکیان باش بێ لە هیچ جۆرە شیعرێکی‌تر باش نابێ چونکە شـاعیر بە هۆی هونـەرەوە سـروود ناهۆنێتەوە بـەڵکو بـە هـۆی هێـزێکی یەزدانی‌یەوە دەیهۆنێتەوە • خۆ ئەگەر بە هۆی یاساکانی هونـەرەوە فێری پیشەکەی ببوایە ئەوسا کە توانی باسی یەکێکیان بکـا دەیتوانی باسی هەموویان بکا •

بەم جۆرە خـوا هۆش لە سـەری شـاعیران دەبـاتـە دەرەوەو دەیانکاتە ئامرازێك بۆ خۆی هەروەکو چـۆن پێشبین‌و پێغەمبەرەکـان دەکاتە ئامرازی خۆی بۆ ئەوەی کە گوێمان لێ‌بوون بزانین ئەمانە لـە کاتی بێ‌هۆشی‌دا ، لە خۆیانەوە ئەم ووشە بەنرخانە دەرنابڕن بەڵکـو قسەکەرەکە خودا خـۆیەتی‌و بە زمانی ئەوانـەوە لەگەڵمـان دەدوێ • [ تینکۆسی کالسیدی ) نموونەیەکی زۆر چاکی ئەمەیە کە باسی دەکەم : چونکە ئەمەیان هیچ شتی وای نەنووسیوە شایەنی دووبارەکردنەوە بێ کەچی شیعرەکەی کە تا ئێستا شتی وا نەنووسراوە بۆتە ویردی سـەر هەموو زارێك بەڵام هـەر وەکو خـۆی دەڵێ شـیعرەکە لە داهـێنانی میوزیس خـۆیەتی • دیارە خـوا بەم هۆیەوە دەیەوێ پێشـانمان بـدا ( بێ ئەوەی گومانمان هەبێ ) کە ئەم شیعرە جوانانە هی بنیادەم نین ، بەرهەمی مرۆڤ نین ، بەڵـکو شـیعری یەزدانین‌و کاری خـوان‌و شاعیرەکان سەر بە خـواکان‌و تەرجومانیـان‌و هیچی‌تر • ئـەدی خـوا کاتی کە بەرزترین گـۆرانی بە زاری خـراپترین شاعیرەوە چـڕیوە مەبەستی هەر ئەوە نەبووە کە ئەم دەرزە دابدات ؟! !

ئایۆن سـترانبیژێکە بەرهـەمی شاعیرە گـەورەکان دەخـوێنێتەوەو تاس‌ولووسیان دەکا • شـاعیر ئیلهامی لە خـواوە بۆ دێ ، سـترانبێژیش

ئیلهامی له شـــاعیرەوه بۆ دێ ، بەم جۆره زنجیـرەی موگناتیسـی درێژ دەبێتەوه • سوکرات به شێوەیەکی زۆر گاڵتەجاڕانه وا له ئایۆن دەکا کـه پێ لێبنێ ئەو کاتەی شیعری هۆمەر دەخوێنێتـەوەو لێکیدەداتەوه هیـچ هۆشی له خۆی نییه :

[ ئایا له پێستی خۆت ناچیته دەرەوەو گیانت مەست نابێو وا هەسـت ناکەی که لەناو ئەو کەسانەو لەو شوێنانه دای که باسیان دەکـەی جـا چ ( ئەتاکا ) بێو چ (تەرواده) بێو دیمەنه شـیعرییەکەش هـەرچییەکی هەبێت ؟! ]

[ سوکرات ، ئەم بەڵگەیه ماڵم کاوڵ دەکا ، چونـکه دەبێ پێلێبنێم کاتێ که چیرۆکیکی بەزەیی دەخوێنمەوه چاوم پڕ فرمێسك دەبێو کـــه باسی ترس‌و توقاندن دەکەم مووم زیك دەبێتەوه دڵم دادەخورێ • ]

سوکرات وەڵام دەداتەوه :

[ باشه ، ئایۆن ، ئـەدی دەرهـەق ئەو کـابرایەچ بێژین کـه لـه ئاهەنگ‌و قوربانی دایەو بەرگی جەژنی لەبەرەو تاجی زێڕی لەسەره کـه کەس ناتوانی لێیبسەنێو بەرامبەر به بیست هەزار برادەر زیاتر دەگری یان زراوی دەچێ بێ ئەوەی کەس شتێکی لێســـەند بێ یا خراپەیەکی دەرهەق کرد بێ ـ ئایا ئەو کابرایه هۆشی له خۆیه ؟ یان نا ؟ ]

ئایۆن دێته ڕایێ •

[ نەخێر ، سوکرات ، ئەگەر ڕاستت دەوێ هۆشی له خۆی نییه •]

ئینجا سوکرات باسی ئەوه دەکات که کارەکەی ئایۆنیش دەوری وا لای گوێگران دەگێڕێو بەم جۆره ئەوانیش ئیلهام وەردەگرن :

[ ئایا دەزانی ، هەر وەکو گوتم ، گوێگـر دوا ئەڵقەیه که هێز لـه

موگناتیسی بنچینەیی وەردەگرێ • سترانبێژیش وەکو تۆو وەکو ئەکتەر وایە ، ئەڵقەی ناوەڕاستە ، کەچی شاعیر یەکەمین ئەڵقـەیە ؟ خوایش چۆنی حەز بکا بەو شێوەیە گیانی خەڵك بەناو ئەو هەمووانەدا بەو لایەدا وەردەگێڕێ کە خـۆی مەبەستی‌یەتی‌و وایان لێ دەکا کـە پێـك‌دا شۆڕ بنەوە • زنجیرەی سەماکەرو سەرەك‌سازو یاریدەرەکانیشـی هەن کە بە لایەك‌دا هەڵواسراون‌و بریتین لەو ئەلقانەی بە میوزدا شـۆڕ بوونەتەوە • هەر شاعیرێك میوزێکی هەیە خۆی پێدا شـۆڕ کردۆتەوەو گوایە سـەر بەوەوەیە ، ئەمەش هەمان شتە چونکە بۆی بۆتە قالب‌و ئامێر • ]

ئینجا سوکرات لەوە دەکۆڵێتەوە ئاخۆ ئەو سترانبێژو ڕوونکەرەوانەی ئیلهام لە شاعیرەوە وەردەگرن دەتوانن لەبارەی هەر باسێکی شاعیرەکەوە حوکمێکی وا بدەن کە لە حوکمی پسپۆڕی باسەکە باشتر بێ ( بۆ نموونە ئایا سترانبێژو سوپاسالار کامەیان دەتوانێ باشـتر ئەو حـوکمە بکا ئاخۆ هۆمەر بە چاکی هونەری شەڕی پێشان داوە ؟ یان نا ؟ )

سوکرات دوای ئەوەی کە لەبارەی ئەم باسـەوە خـراپ سـەر لە ئایۆن دەشێوێنێ سەیریش‌نی‌یە ، چونکە سوکرات کە بەم شێوەیە پرسیار ڕەپێش دەکا بە دوای مەسەلەی بنچینەیی جیاوازی نێوان شیعرو زانستدا دەگەڕێ • ناچـاری دەکـا لەوە سەرپشـك بێ کە یـان تاوانی ناپاکی هەڵگرێ یان پێ لێ‌بنێ کە خـۆی هیـچ نازانێ‌و تەنیـا بە ئیلهام شـت دەخوێنێتەوەو ڕوونی دەکاتەوە •

[ ئایۆن ) فراوانترین لێکۆڵینـەوەی جیهانی کـۆنە لە بارەی ئـەو بیروباوەڕەی کە شیعر بە ئیلهـامی ڕووت دادەنـێ - ئەم بیروبـاوەڕە مێژوویەکی دوورودرێژی هەیەو زۆر گـۆڕانی بەسـەردا هاتووەو تـا

ڕۆژی ئەمڕۆش هەر لە برەو دایە • دوو هەزار ساڵ دوای ئەو ، درایدن لە ( Absalom and Ashitophel ) دانووسیویەتی

[ بێگوما ئەقڵی گەورە زۆر لە شێتییەوە نزیکە • ]

**شێتو دڵدارو شاعیر**
**هەموو لەبارەی خەیاڵەوەیەکێن**

بێگومان دەشێ ئەفلاتون ئایۆنو پارچەکەی فیدرۆسی بە بێباکی نووسیبێ • ڕاستی ئەو بیروباوەڕەی لە کتێبی دەیەمی ( کۆمار )دا دەربارەی شیعر پێشانی داوە زۆر لەگەڵ ئەمە جودایە • بەڵام ئەم ڕاستییە بایەخێکی وای نییە چونکە فەیلەسووفیش وەکو هەر کەسێکیتر هەقی تەواوی هەیە بیروباوەڕی خۆی بگۆڕێ • بەڵام لەو گاڵتەیەی کە لە ئایۆندا هەیەو لەو شێوەی کە سوکرات ئایۆنی پێ دەکاتە گەمژە ، ئاشکرا دیارە کە ئەفلاتون پێ لەسەر جیاوازی نێوان شاعیرو فەیلەسووف دادەگرێو بەلای پەرژەوەندی فەیلەسووفەکە دایدەلەنگێنێ • ڕەنگە هەر لەبەر پێداچوونەوەو ووردکردنەوەی ئەم جیاوازییەش بێ وای لێهاتبێ ئەم هەڵوێستەی هەبێ کە لە ( کۆمار ]دا چەسپاندوویەتی •

ئەوەش گرنگە کە ئەو تیوری ئیلهامەی ئەفلاتون لە ( ئایون )دا پێشکەشی کردووە هیچی لەبارەی درۆکردنی شاعیرەوە تێدا نییە : شاعیر ڕاستەقینەی یەزدانی دەردەبڕێ بەڵام ئەفلاتون ئەوەندە پێداناچێ کە بڵێ ڕاستەقینەی یەزدانیش هەندێ جار وەکو ناڕاستەقینەی رووت دەکەوێتە بەر چاوی ئادەمیزادی ئاسایی • ڕاستی ، ( ئایۆن ) وای دادەنێ

که ئەوەی شاعیر باسی دەکا شتێکی راستەقینەو جوانە بۆیە ناتوانین بڵێین ئەفلاتوون بۆیە پەنا دەباتە بەر تیوری ئیلهام تا لە درۆکردنو بەرەنـلایی پاکانە بۆ شاعیر بکات •

ئەو کاتەی کە ئەفلاتون زیاتر پەرەی بە بیروباوەڕی ڕەوشتخوازی خۆی داوە ڕەنگە زیاتر بیری لە لێپرسینەوەی ڕەوشتخوازی شاعـــیر کردبێتەوە • لەوانەیە هەر ئـەم پێشـکەوتنەی بـیروباوەڕی ئەفـلاتونو مشتومالکردنی مەسەلەی ڕکابەری نێوان شاعیرو فەیلەسووف بوو بـێ بە هۆی ئەو تاوانەی کە ئەفلاتون لە کتێبی دەیەمی ( کۆمار )دا لە ملی شاعیری ڕاکردووە •

# هەنگاوێکی تر ...

خوێندەواری ئازیز ....

بێ گومان ئەدەبی کوردیش وەکو ئەدەبی هەموو نەتەوە زیندووەکانی دی لە گەشەکردن‌دایەو ڕۆژ بە ڕۆژ پێویستی بە متوربەکردن هەیە ؛ بەڵام جێی داخە تا ئێستا بایەخێکی ئەوتۆ بە وەرگێڕان نەدراوە . ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچێ هیچ شاکاری بەرزی ئەدەبیاتی بیانی نەکراونەتە کوردی بۆیە هەر هەنگاوێکی لەم بارەیەوە هەڵبگیرێ سوودی هەیەو جێگای خۆی دەگرێ .

لێرەدا ( کتێبخانەی حەیدەری ) زۆری پێ خۆشە بەشداری‌یەکی ئەم خزمەتە بکات‌و ئەدەبێ بێگانان ) لەسەر ئەرکی خۆی چاپ بکاتەو بیخاتە ناو کتێبخانەی کوردی‌یەوە .

هیواداریـن بتوانین بەم کارە خزمەتێکی بچووکی ئەدەبی کوردیمان بکەین .

**مومتاز حەیدەری**

# هەڵەو ڕاست

| لاپەڕە | دێــــر | هەڵەکە | ڕاستەکەی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٣ | ١٣ | نەتەوایەتی‌وە | نەتەوایەتی‌یەوە |
| ٣ | ١٤ | کەسێکی | کەسێکی بیانی بە |
| ٥ | ١ | پێر | پێژ |
| ٧ | ١١ | یـان | پـان |
| ١١ | ٥ | کردە | کردەوە |
| ١٥ | ٧ | نزکە | نرکە |
| ٣٠ | ١١ | کاترا کان | کانزا کان |
| ٣٥ | ٩ | خۆڵی‌لە | خۆڵی لە پێڵاوی |
| ٣٨ | ١١ | زانـا | زانـاو |
| ٣٩ | ١٣ | لێ‌داتەوە | لێ‌ناداتەوە |
| ٤٠ | ١ | خۆڵ | فـۆڵ |
| ٤٠ | ٤ | بەلاوە | بەلایەوە |
| ٤٥ | ٢٠ | سوورە | سوور |
| ٤٦ | ٣ | سەگەکەش | سەگەکەشی |
| ٥٠ | ٩ | جارگەز | جارگەزی |
| ٥١ | ١٢ | پیچی | پیپی |
| ٥١ | ٢٠ | زنجیرەی | بەو زنجیرەی |
| ٥٣ | ١ | ریمۆند | ریچمۆند |
| ٥٣ | ٢٠ | دەبوەوی | دەبوەوە |
| ٥٥ | ١٧ | هەندێت | هەندێ |
| ٦٠ | ٤ | سێدارەوانی | سێدارەدانی |
| ٦٣ | ٢٢ | ئەوە | ئەوە بوو |
| ٦٦ | ١٧ | بخەسێنمەوە | بحەسێنمەوە |

| لاپەڕە | دێـر | هەڵەکە | ڕاستەکەی |
|---|---|---|---|
| ٦٧ | ١٢ | لێـکی | ساڵێـکی |
| ٦٨ | ٨ | زیاتر | زیاترە |
| ٦٩ | ٢١ | پێویست | پێویستت |
| ٧٠ | ١٩ | نموونە | بۆ نموونـە |
| ٧١ | ٨ | سوولەی | سولالەی |
| ٧١ | ١٤ | ناردرێتەوە | ناشاردرێتەوە |
| ٧٢ | ١٣ | مەهیچ | لەهیچ |
| ٧٢ | ١٩ | ئەوە | ئەوە دەکا |
| ٧٤ | ٩ | هەر | هەر لە |
| ٧٥ | ١٠ | گەواهر | گەواهی |
| ٧٦ | ١٨ | هیچ | هیچ بەڵگەیەکی |
| ٧٩ | ١٥ | شیو | شێوە |
| ٨١ | ١٢ | پراکیـکی | پراکـتیکی |
| ٨٢ | ٧ | مشتەختی | مشەختی |
| ٨٢ | ٢٠ | ئەسێ | ئەم سێ |
| ٨٧ | ٣ | داریڤیس | دایچیس |
| ٩٠ | ١٦ | بۆش | بۆیەش |
| ٩١ | ١٣ | نەکراوە | نەکراو |
| ٩١ | ١٥ | حاڵەش | حەلەش |
| ٩٢ | ١٣ | خووانەو | خودانەو |
| ٩٢ | ١٨ | قۆناغەکانی | لە قۆناغەکانی |
| ٩٣ | ١٥ | تەپـا | تـەپ |
| ٩٧ | ١٣ | جاکی | چاکی |
| ٩٨ | ٥ | یەکێ | یەکن |

# ڕاست کردنەوە

ـــ ل (٧) دێری (١٣) زیادە ، ئەمەی دەخرێتە جێ (عەمرێ خوای کرد)

ـــ ل (٨) دوای دێری (١٧) ئەمە پەڕیوە :
(کۆنوتیتۆ تێیدا خەوتبوو ، دواجار سەری بۆ لای)

ـــ ل (٩) دێریّ (١) دوای ووشەی (جوانا) ئەمە پەڕیوە :
(هێشتا هەر لە خەو دابێ ، چاوە ڕەشەکانی)

ـــ ل (١٢) دێری (١٩) دوای ووشەی جۆلانە ئەمە پەڕیوە :
( ڕاکێشان ، کینۆو جوانا لە شوێن خۆیان )

ـــ ل (١٨) دوای دێری (١٦) ئەمە پەڕیوە : ( پێدەکاو چاوی دەشکێنێ)

ـــ ل ٢٨ دوای دێری (٥) ئەمە پەڕیوە :
( ئەفسەرەکە گوتی ئەم بەیانی‌یە چووینە )

ـــ ل ٢٩ دێری (١٧) ئەمەی لێ پەڕیوە :
( نەدەبوو ئەو ڕۆژە بچیتە ئەو ڕێیە )

ـــ ل (٤٤) دێری (٤) دوای ( چەقاند ) ئەمە پەڕیوە :
(بە درێژایی شەو سنگی لە سەر دڕکەکە بووو گۆرانی)
دێری (٢١) دوای ووشەی (خوێنی دڵی) ئەمە پەڕیوە :
(بولبول سووور دەبێ ، بنەگوڵەکە هاواری کردە بولبولەکە بۆ ئەوەی
زیاتر سنگی بە دڕکەکەوە بنووسێنێ) •

ـــ ل ٥٣ دێری (٣) دوای (پیپ) ئەمە پەڕیوە :
(کرد لەگەڵ ئەستێلادا بچێ و ئەم ئەرکەش تاڵخۆشی لە خۆشی پتر
تێدا بوو بۆ پیپ )

ـــ ل ٧٢ دوای دێری (١٥) ناونیشانێك كەمە ( پۆنگ پۆنگ پۆنگ )

ـــ ٧٣ دوای دێری (١٣) ئەمە پەڕیوە :

( هێرش بەرێتو نە بە چەكوشەكە دەتوانێ )

ـــ ل ٧٦ دوای دێری (٧) ئەمە پەڕیوە :

( ئەم ڕووداوە وای لێ كردن پارچە زەوی‌یەكەیان بخەنە ڕەهن )

ـــ ل (٨٥) دێری (١٣) ووشەی ( Quarto ) پەڕیوە •

ـــ ووشە ئینگلیزی‌یەكان زۆریان هەڵە نووسراون ، چاكردنەوەیان زۆری دەویست ، ببوورن •

---

# ئەدەبی بێگانان

## بەرگی دووەم

## تایبەتی‌یە بە چیرۆكو ئامادەیە بۆ چاپ

---

لاپەڕە

FOREIGNERS LITERATURE

Vol : I

Edited by :

AZIZ GARDI

# أدب الأجانب

**الجـزء الاول**

باشـراف

**عزيز گەردی**

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ٣٣١ لسنة ١٩٨٢